بەشێک لە پەیامەکانی نوور

# تەوحید



هەندێ لە بەروبوومەکانی، بەڵگەکانی، نیشانەکانی



بەدیعوززەمان
سەعیدی نوورسی
دایناوە

فاروق ڕەسووڵ یەحیا
کردوویە بە کوردی

**ئەم پەیامە:**
* مامۆستا (**بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی**) بە زمانی تورکی دایناوە.
* مامۆستا (**ئیحسان قاسم صالحی**) لە زمانی تورکییەوە کردوویەتی بە عەرەبی.
* (**فارووق ڕەسووڵ یەحیا**) لە عەرەبییەوە کردوویە بە کوردی.
* مامۆستا (**حسەین حەسەن کەریم**) لەگەڵ دەقی عەرەبییەکەدا بەرامبەری کردووە.
* چاپی یەکەم: سلێمانی ١٤٤٢ك - ٢٠٢٠ز.
* (**ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا**) نەخشەی بەرگی کێشاوە و بڵاوی دەکاتەوە.

* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٦٥)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێ دراوە.

بەشێك لە پەیامەكانی نوور

# تەوحید

## هەندێ لە بەروبوومەكانی.. بەڵگەكانی.. نیشانەكانی

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

كردوویە بە كوردی

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ (محمد: ١٩)

﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ (لقمان: ١٣)

## تیشکی دووهەم

# تەوحید

### هەندێ لە بەروبوومەکانی.. بەڵگەکانی.. نیشانەکانی

**دواهەمین بەروبوومی بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" و تیشکی دووهەمی بریسکەی سی و یەکەم**

ئەم تیشکە هەندێ نارێکی و ئاڵۆزیی ئاوێتە بووە، چونکە بەوپەڕی خێرایی دانرا و بە خەتی ناخۆشی خۆم نووسرایەوە لە بارودۆخێکیشدا کە بە دەست تەنگانە و گیروگرفت و بێزارییەوە دەتلامەوە، دوای ئەوەی کە برایانم لە بەندیخانەی "ئەسکی شەهر" ئازاد کران و من بە تەنیا لەوێ مامەوە.

وا لەم ڕۆژانەدا - واتە دوای شازدە ساڵ[1] - کە دەستم بە هەڵەگیری و پێداچوونەوەی کرد، بۆم دەرکەوت کە ئەم پەیامە لە گۆشەی "تەوحید" و "ئیمان"ەوە لەوپەڕی هێز و گرنگیدایە.

**سەعیدی نوورسی**

---

(١) واتە لە ساڵی ١٩٥٢زدا، چونکە بەندیخانەی ئەسکی شەهر لە ساڵی ١٩٣٦زدا بووە. (وەرگێڕ)

**حەوتەمین سەرنجی گەورەی تایبەت بە ئیسمی ئەعزەمی "اللّهُ أحد"ە و، حەوتەمین دانەی شەش سەرنجەکەی شەش ناوەکەی ئیسمی ئەعزەمە.**

**بێدارکردنەوەیەك**

پێم وایە ئەم پەیامە گەلێ گرنگە، چونکە چەندین نهێنیی مەزن و واتای وردی ئیمان دەردەخات. جا هەرکەسێك بە وردبوونەوە و تێڕامانەوە بیخوێنێتەوە، بە پشتیوانیی خوا، ئیمانەکەی خۆی ڕزگار دەکات.

لەبەر ئەوەی کە - بەداخەوە - لەم بەندیخانەیەدا دەستم بە کەس نەگەیشت، ئەوا پاکنووس نەکرا و سەرلەنوێ نەنووسرایەوە و نەمتوانی داوا لە کەسێك بکەم پاکنووسی بکات.

گەر دەتەوێت هەر بۆ خۆت پەی بە مەودای نرخی ئەم پەیامە و پایەی بڵندی ببەیت، ئەوا لە پێشدا بەروبوومی "دووهەم" و "سێهەم" بخوێنەرەوە کە لە سەرەتای پەیامەکەدان، پاشان کۆتاییەکە و مەسەلەکەی پێش خۆی بە وردی بخوێنەرەوە، ئنجا بە هێمنی و لەسەرخۆیی موتاڵای تەواوەتیی سەرجەمی ئەم پەیامە بکە.

بسم الله الرحمن الرحيم

**وبه نستعين**

بەهۆی ڕێژنەی ڕووناكییەكانی سەرنجێكی درەخشانی ئایەتی پیرۆزی: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلـهَ إِلاَّ اللّـه﴾ (محمد:١٩) و، بە ئیلهام و ئاماژەی سوێندێكی زانراوی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ هەستێكی یەكجار جوان و ناسك و شیرینم بەم "سەرنجە" كرد.

ئەم سەرنجە سێ "بەروبوومی تەوحید" و، سێ دانە لە "داخوازییەكان"ی و، سێ بەڵگەشی لە "بەڵگەكان"ی گرتووەتە خۆ.

بەڵێ، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ زۆربەی جار كە سوێندی دەخوارد ئەمەی دووپات دەكردەوە كە دەیفەرموو: "والَّذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِه"(١).

ئەم سوێندە نەبەوییە مەزنە ئەوە دەردەخات كە فراوانترین بازنەكانی درەختی گەردوون و دوا لق و دوورترین پەلەكانی ئەو درەختەش لە ناوەندی توانستی خوای گەورەی تاك و تەنیا و لە ژێر ڕكێفی ویستی ئەودان. چونكە لە كاتێكدا كە گەورەترین و بەڕێزترینی بەدیهاتووان كە حەزرەتی محەممەدە ﷺ خاوەنی خودی خۆی نەبێت و لە كردارەكانیدا ئازاد و سەربەست نەبێت، بەڵكو هەموو كردار و وەستان و جموجوولێكی پابەندی ویست و ئیختیاری یەكێكی تری غەیری خۆی بێت، ئەوا دەبێ هیچ شتێك و هیچ حاڵەت و بارودۆخ و چۆنێتییەك، با زۆر "جوزئی" یان "كوللی"ش بێت، لە بازنەی ئەو توانستە مەزن و ویستە گشتی و هەمەلایەنەیە بەدەر نەبێت كە دەورانـدەوری هەموو

---

(١) روى ابن ماجه عن رفاعة الجهني وأحمد في مسنده (١٦/٤): كان ﷺ إذا حلف قال: (والَّذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ).

شتێکیان داوە و هەموو شتێکیان گرتووەتەوە. جا ئەم سوێندە نەبەویـیە ڕەوان و پـڕ لە واتـا قـوولە، تەوحیـدێکی پەروەردگـاریی هێنـدە مەزن دەردەبڕێـت کە لەوپەڕی مەزنی و گشتگیریدایە.

لە کۆمەڵە پەیـامی "سراج النـور"دا[1] سـەد بەڵـگە، بەڵکـو هەزار بەڵـگەی درەخشـانمان سـەبارەت بە چەسـپاندنی ئەم تەوحیـدە هێنـاوەتەوە. بـۆیە چەسپاندن و درێژەدان بە باسی ئەم ڕاسـتییە بەرزە بەو کـۆمەڵە پەیـامەی نـوور دەسپێرین. بەڵام لەم تیشکی دووهەمەدا بە پوختی و لە ناوەندی سـێ مەقامـدا ئەو ڕاستییە ئیمانییە مەزنە ڕوون دەکەینەوە.

لە مەقامی یەکەمدا: زۆر بە پوختی بەروبوومی ئەو ڕاستییەی تەوحید بـاس دەکەین کە چەندین بەروبوومی زۆر و زەبەنـدەی هەمەکیـی ئەوتۆیـان هەیە کە لەوپەڕی گرنگـــی و ناســـکی و لەزەت و ڕووناکیــــدان. هــــاودەم لەگەڵ ئاماژەکردندا بۆ ئەو چێژ و هەست و نەستانەی خـۆم کە منیـان بـۆ وەرگـرتن و نۆشینی ئەو بەروبوومانە دایە بەر.

لە مەقامی دووهەمیشدا: سێ خوازیار و هۆکار بۆ ئەم ڕاسـتییە بەرزە ڕوون دەکرێنەوە. خۆ هەرچەندەش ئەمانە سێ داخـوازن بەڵام لە هێـز و پێـزی سـێ هەزار خوازیار و هۆکاردان.

لە مەقـامی سێهەمیشـدا: تەنهـا سـێ نیشـانەی ئەو ڕاسـتییە درەخشـانەی تەوحید باس دەکرێن، بەڵام ئەم سیانە - لە ڕاستیدا - لە هێزی سێسەد نیشـانە و بەڵگەدان.

---

(١) کۆمەڵە پەیامێکی نوورە کە ئەم پەیامانەی لەخۆ گرتووە:
موناجات، بیماران، پیران، پلەکانی ئایەتی: ﴿حَسْبُنَا اللهُ وَ نِعْمَ الْوَكِيـلُ﴾ (تیشکی چـوارەم)، حیکمەتی خۆپەنادان لە شەیتان، پەنجەرەکـان، بەرگـری لەخـۆکردنی مامۆسـتا نـوورسی لە بەندیخانەی دەنیزلی، نیشانەکانی قیامەت (تیشکی پێنجەم)، هەروەهـا چەنـد باسـێکی تـری پەیامەکانی نوور. (وەرگێڕ)

# مەقامی یەکەم

## هەندێ لە بەروبوومەکانی تەوحید

### ❖ بەروبوومی یەکەم

"جـوانی"ی خواوەنـد و "کەمـاڵ"ی پەروەردگـار لە تەوحیـد و یەکتاییـدا دەردەکەون. ئەگەر تەوحید نەبوایە ئەو گەنجینە ئەزەلییە هەر شارراوە و پەنهـان دەمایەوە.

بەڵێ، گەر لە ئاوێنەی تەوحیددا و بەهۆی یەکتایی و نووری درەوشـانەوەی نـاوە جوانەکـانی خواوەنـدەوە نەبێـت، کە لە ڕوخسـاری هەمـوو جوزئیـاتی ئەوپەڕی لق و پەلەکـانی درەختـی بوونەوەرانـدا هەن، ئەوا هەرگیـز جـوانی و کەماڵی نەبڕاوە و نیعمەتە بێسنوورەکانی خواوەنـدی پەروەردگـار و صـەمەد و میهرەبان نابینرێن و دەرناکەون.

بۆ نموونە: ناردنی شیرێکی پـوختی خـاوێن لە نێـوان خـوێن و سـیخوڕی زیندەوەرەوە بۆ شیرەخۆرێکی ساوا و بچووك کە خاوەنی هیچ هێـز و توانـایەك نیـیە و ئەم نـاردنەشی هەر لە حسـابدا نەبـووە، ئەم کـارە - خـۆی لە خۆیـدا - کارێکی جوزئییە. بەڵام هەر هێندەی کە بە ڕوانینی "تەوحید" سـەیری ئەم کـارە جـوزئییە دەکرێـت، ئەوا جـوانیی هەمیشـەیی سـۆز و میهرەبـانیی خواوەنـدی میهرەبان بە جوانترین کەماڵ و درەخشانی لە ژیاندنی دەراسای گشـت منـاڵ و بێچـووانی سەرانسـەری جیهانـدا دەبینرێـت، هەروەك لەو سـۆز و شـەفەقەتە لەڕادەبەدەرەدا بەرجەسـتە دەبێـت کە دەورانـدەوری ئەو سـاوا و بێچـووانەی داوە و دایکانیانی بۆ گوێڕایەڵ و ملکەچ کردوون..

بەڵام ئەگەر لە ڕوانگەی تەوحیدەوە سەیری ئەم کاری شیرناردنە نەکرێت، ئەوا ئەو جوانییە درەخشانە بە تەواوی ون دەبێت و هەرگیز دەرناکەوێت. چونکە ئەو ژیاندنە جوزئییە - لە کاتێکی وادا - دەدرێتە پاڵ "ڕێکەوت" و "سروشت" و "هۆکارەکان". دیارە ئەو کاتەش نرخ و ماهییەتەکەی خۆی لەدەست دەدات.

هەروەها بۆ نموونە: کاتێك لە ڕوانگەی "تەوحید"ەوە سەیری چاکبوونەوەی کەسێك لە نەخۆشییەکی سەخت دەکرێت، ئەوا بە درەخشانی و تەواوەتی جوانیی ئەو شەفەقەتە بەسۆز و میهرەبانە دەردەکەوێت کە بەسەر ڕووی بەخشینی شیفاوە دەبینرێت بۆ هەموو بیمار و نەخۆشەکانی ئەم نەخۆشخانە گەورەیەی کە ناوی "گۆی زەوی"ی لێ نراوە و دەرمان و چارەسەری شیفابەخشیان بە هاناوە دەبرێت لەم دەرمانخانە گەورەیەی کە ناوی "جیهان"ی لێ نراوە!

بەڵام گەر ئەم کارە جوزئییەی "شیفابەخشین" کە بە زانست و بەسیرەت و هەست و شعوورەوە ئەنجام دەدرێت، بە ڕوانینی تەوحید سەیر نەکرێت، ئەوا چاکبوونەوە و شیفای نەخۆشی دەدرێتە پاڵ تایبەتکاریی دەرمانە بێگیان و هێزە کتوکوێرەکان و سروشتی کەڕ و لاڵ. دیارە لە کاتێکی وادا ئەو بەخششە میهرەبانییەی پەروەردگار نرخ و ماهییەت و حیکمەتی خۆی بە تەواوەتی لەدەست دەدات.

بە بۆنەی ئەم شوێن و مەقامەوە، سەرنجێکی ناسکم لە نێوان سەرنجەکانی سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ هاتەوە یاد، وا لێرەدا ڕوونی دەکەمەوە:

ئەم سڵاواتەی خوارەوە لەلای شافیعی مەزهەبەکان گەلێ بەناوبانگە و زۆر جار دووپاتی دەکەنەوە و لە دوای زیکر و ویردەکانی نوێژەوە دەیخوێنن:

(اللّهم صلّ على سيدنا محمدٍ وعلى آل سيدنا محمدٍ بعدد كل داءٍ ودواءٍ وبارك وسلّم عليه وعليهم كثيراً كثيراً).

ئەم سڵاواتە پیرۆزە گەلێ گرنگە. چونکە حیکمەتی بەدیهێنانی مرۆڤ و نهێنیی زۆری و هەمەلایەنیی توانا و لێهاتنەکانی لەوەدایە کە لە هەموو کات و سات و خولەکێکدا هانا بۆ بەدیهێنەری بەخشندە و میهرەبانی ببات و لێی بلاڵێتەوە و شوکرانە و حەمد و سوپاسی بۆ ئەنجام بدات.

جا بەهێزترین پاڵنەری کاریگەر و هاندەری کارامە کە مرۆڤ بۆ لالانەوەی بەردەم حوزووری خواوەند بداتە بەر، تەنها دەرد و نەخۆشییەکانە. هەروەك جۆرەکانی شیفا و دەرمان و چارەسەر و چاکبوونەوەکانیش لە پێشەکیی ئەو نیعمەتە خۆش و بەلەزەتانەوە دێن کە بە شەوق و تاسەمەندییەکی تەواوەتییەوە مرۆڤ دەخەنە شوکرانەبژێری و سوپاسگوزاری و منەتباریی خواوەندەوە بە هەموو واتایەکی ئەم شوکر و سوپاس و منەتبارییە.

لەبەر هەموو ئەمانە، ئەم سڵاواتە پیرۆزەی کە لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەدرێت، نرخێکی بەرز و واتایەکی قووڵی لەخۆ گرتووە.

تەنانەت هەرکات کە دەڵێم: "بِعَدَدِ کُلِّ داءٍ و دَواءٍ" بەوپەڕی ڕوونی و ئاشکرایی هەست بە "بوون" و شەفەقەتی کامڵ و میهرەبانیی تەواوەتی و بەرز و فراوانی شیفابەخشی ڕاستەقینە دەکەم لە بەخشینی دەرمان و چارەسەرییەکانی هەموو نەخۆشی و دەردە ماددی و مەعنەوییەکانی سەرانسەری زەویدا، کە بە نەخۆشخانەیەکی گەورە و فراوانی دەبینم.

هەروەها بۆ نموونە: گەر لە ڕوانگەی تەوحیدەوە سەیری بەخشینی ئارامی و ئاسوودەیی ئیمان بکرێت بە دڵێك کە گیرۆدەی چەندین ئازاری مەعنەوی و ترسناکی گومڕایی بووبێت، ئەوا ئەم ڕوانینە وا لەو کەسە تەنیا و دەستەوسان و فانییە دەکات کە ببێت بە بەندەیەکی قسەبۆکراوی پەرستراوە مەزنەکەی خۆی کە پادشای گەردوون و پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە. هەروەها بەو ئیمانە بەختەوەرییەکی هەمیشەیی و موڵکێکی نەبڕاوەی لەوپەڕی فراوانی و جوانی و خانەیەکی هەتاهەتایی پێ دەبەخشرێت. تەنانەت ئەو

ڕوانينە وا لە هەموو ئيمانداريك دەكات كە - هەريەكەيان بەپێى پلەى خۆى - لەو لوتف و كەرەم و بەخششە گشتى و بەردەوامەيان پێ خەڵات بكرێت..

بەم جۆرە و لە ڕووى ئەم نيعمەت و چاكەكارييە يەكجار گەورەيەدا، بەڵكو لە سيما و ڕوخسارى جوانيى خاوەن چاكە و بەخششى ڕەهادا، ئەو جوانييە ئەزەلى و ئەبەدييە دەبينرێت كە هەرگيز فەنا و نەمان توخنى ناكەوێت. تەنانەت يەك بريسكانەوەى درەخشانى ئەو جوانييە هەموو ئيمانداران دەخاتە ملكەچى و گوێڕايەڵيى فەرمانەكانى ئەو خواوەندە، بەڵكو هەندێكيان دەكات بە شەيدا و ئەويندارى ئەو جوانييە.

بەڵام ئەگەر لە ڕوانگەى تەوحيدەوە سەيرى چاكەكارى و بەخششى هيدايەتدانى ئەو كەسە نەكرێت، ئەوا ئيمانى جوزئيى ئەو تاكە كەسە دەدرێتە پاڵ خودى خۆى - وەك ناحەقڕەوە موعتەزيلەكان پێيان وايە - يان دەدرێتە پاڵ هەندێك لە هۆكارەكان. ديارە ئەو كاتەش ئەو گەوهەرە ڕەحمانييە بەنرخەى كە جگە لە بەهەشتى هەميشەيى هيچ شتێك لە نرخ و بەهايدا دەرناچێت، دادەبەزێتە ئاستى پارچە شووشەيەكى بێ نرخ و بەها، دواى ئەوەى كە ڕۆڵى ئاوێنەيەكى دەگێڕا بۆ دەرخستن و دانەوەى بريسكەيەكى جوانييەكى خاوێن و موقەددەس.

بەم جۆرە و بە وێنەى ئەو سێ نموونەيە، هەزاران جۆرى جوانيى خواوەند و سەدان هەزار چەشنى كەماڵى پەروەردگار هەن كە لە ڕوانگەى "تەوحيد"ەوە دەردەكەون و مرۆڤ لێيان تێدەگات و دێنە دى و دەچەسپێن. چونكە ئەو جۆرە جوانييە خوايى و كەماڵە پەروەردگارييانە لەو حاڵەتە جوزئييانەى بچووكترين شتى جوزئيدا جێگير بوون كە لەوپەڕى بازنەى "زۆرى"ى ناو بوونەوەراندان.

جا دەركەوتنى ئەم جوانى و كەماڵەى خواوەند لە ڕێى تەوحيدەوە بۆ دڵەكان و هەست پێكردنيان لە گيانى مرۆڤدا، هانى هەموو ئەوليا و پياوچاكانى

خاوێنی داوە کە شیرینترین چێژ و بەتامترین و خۆشترین ڕۆزیی مەعنەویی خۆیان لە زیکر و دووپاتکردنەوەی وشەی تەوحید: (لا إلـهَ إلاّ اللّـه)دا بدۆزنەوە.

ئنجا لەبەر ئەوەی مەزنیی گەورەیی خواوەند و شکۆمەندییەکەی و سام و هەیبەتی پەروەردگارییە صەمەدانییەکەی لە وشەی تەوحیددا دێتە دی، ئەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(أفضَلُ ما قلتُ أنا والنبيون مِن قبلي: لا إله إلاّ اللّه)[1].

بەڵێ، یەك دانە بەر و یەك دانە گوڵ و یەك دانە ڕووناکی، هەر یەکەیان بە وێنەی ئاوێنەیەکی بچووك، ڕۆزییەکی سادە و نیعمەتێکی جوزئی و چاکەیەکی ئاسایی دەردەخەن.

بەڵام بەهۆی نهێنیی "تەوحید"ەوە ئەو ئاوێنە بچووکانە ڕاستەوخۆ لەگەڵ هاوچەشنەکانیاندا یەکدەگرن و شان بە شانی یەکتر پاڵ بە یەکەوە دەدەن تا ئەو "جۆر"ە دەبێت بە ئاوێنەیەکی فراوانی یەکجار گەورە و جۆرێکی جوانیی خواوەند دەردەخەن کە بە درەوشانەوەیەکی تایبەت بەو "جۆر"ە تیایدا دەردەکەوێت.

ئیتر بەم شێوەیە و لە ناوەندی ئەو جوانییە فانی و کاتییەوە نهێنیی تەوحید جوانییەکی باقی و هەمیشەیی دەردەخات.

---

(١) جزء من حديث: (أفضل الدعاء يوم عرفة وأفضل ماقلت أنا والنبيون من قبلي: لا إله إلاّ اللّه وحدَه لاشريكَ له) رواه مالك عن طلحة بن عبيد الله بن كرير مرسلاً، وأخرجه الترمذي وحسنه عن عمر بن شعيب عن أبيه عن جده بلفظ: خير الدعاء يوم عرفة، وزاد: له الملك وله الحمد وهو على كل شئ قدير. ورواه البيهقي عن أبي هريرة بلفظ: أفضلُ الدعاء دعاءُ يوم عرفةَ وأفضلُ قولي وقولُ الأنبياء قبلي لا إله إلاّ اللّه.. (كشف الخفاء ١/١٥٣). وأخرجه الأصبهاني في الترغيب (١/٣٣١ المدينة) بلفظ مقارب. وانظر أيضاً موطأ الإمام مالك برقم ٥٠٠ و ٩٥٥.

بەو واتایەی کە ئەو شتە جوزئییە بەهـۆی نهێنیـی تەوحیـدەوە دەگۆڕێـت و دەبێـت بە ئـاوێنەیەك بـۆ تیـادەرکەوتنی جـوانیی خواوەنـد، وەك مەولانـا جەلالەددینی ڕۆمی[1] وتوویەتی:

آن خیالاتی کە دام اولیاست عکس مهرویان بوستان خداست[2].

بەڵام گەر لە ڕوانگە و دیدی تەوحیدەوە سەیری ئەو جوانییە نەکرێـت، واتە گەر نهێنیی تەوحید نەبوایە، ئەوا ئەو بەرە جوزئییە شتێکی بەرباد و تاك و دابڕاو دەبوو لە هاوچەشنەکانی و، ئیـتر ئەو جـوانییە خـاوێن و کەمـاڵە بەرز و بڵنـدە دەرنەدەکەوت، تەنانەت ئەو بریسکانەوە جوزئییەش کە پێـیەوە دەبریسـکێتەوە، ئەویش دەکوژایەوە و بەزایە دەچوو و سەرەوخوار هەڵـدەگەڕایەوە و لە نـرخ و

---

(١) مەولانا جەلالەددینی ڕۆمـی لە شـاری (بەلەخ) لە دایـك بـووە و لە شـاری (قـۆنیە)ش کۆچی دوایـی کـردووە. لە نێـوان سـاڵەکانی: (٦٠٤-٦٧٢ك/ ١٢٠٧-١٢٧٣ز)دا ژیـاوە. لە فیقهی حەنەفی و سەرجەمی زانستەکانی ڕۆژگاری خۆیدا زانایەکی بەناوبانگ و بەتوانا بووە. دوای وەفـاتی بـاوکی لە سـاڵی (٦٢٨ك)دا لە چـوار قوتابخـانەی شـاری "قـۆنیە"دا وانەی وتووەتەوە. پاشـان ڕێبازی تەسەووفی گرتووەتەبەر و (شەمسی تەبریزی) لەم بوارەدا ڕابەری کـردووە. پاشـان تەریـقەتی "مەولەوی"ی دامەزرانـدووە. گەلـێ بەرهەمـی دوای خـۆی بەجێهێشتووە، وەك (فیه ما فیه، دیوان شمس تبریزی، کە پێیشـی دەوترێ: دیوان کبیـر) بەڵام بەناوبانگتریان (مەسنەویی مەعنەوی)یە کە بیسـت و شـەش هەزار بەیتـی شـیعرە بە زمـانی فارسی و، بۆ چەندین زمانی جیهانی وەرگێـڕراوە و بـووە بەهـۆی بڵاوبـوونەوەی ناوبـانگی مەولانا لە سەرتاسەری جیهاندا. بۆ زانینی درێژەی ژیانی بڕوانە: (مولانا جلال الدین الرومی فـی حیاتـه وشـعره، تـألیف: الـدکتور محمـد عبدالسـلام الکفـافی، دار النهضـة العربیـة، بیروت،١٩٧١) هەروەها بەرگی یەکەمی: (رجـال الفکـر والـدعوة فـی الإسـلام) نووسـینی خوالێخۆشبوو (السید أبو الحسن الندوي). (وەرگێڕ)

(٢) بڕوانە: (مثنوی معنوی ١٦/١ چاپ انتشارات علمی). مامۆستا مەلا محەممەدی شڵماشی بەم جۆرەی خوارەوە بۆی کردم بە کوردی:

ئەو خەیاڵانەی کە داوی ئەولیان عەکسی مەهڕوویانی بێستانی خودان!

(وەرگێڕ)

بەهای ئەڵماسی گرانبەهاوە دادەبەزیـیە ئاسـتی وردە شووشـەی شـکاوی بـێ نرخەوە.

ئیتر بەم جۆرە و بەهۆی نهێنیی تەوحیدەوە "کەسایەتی"یەکی پەروەردگاری و "سـیما"یەکی مەعنەویـی ڕەحـمانی - لە ڕووی حەوت سـیفەتەکانەوە - و کۆبـوونەوە و چڕبـوونێکی "نـاوە جوانەکـان" و درەوشـانەوەیەکی "دەستنیشانکاری"ی ئەو کەسەی کە بە گوفتاری: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ گفتوگـۆی لەگەڵ کـراوە، لە سـەرجەمی زیندەوەرانـدا دەردەکەوێـت کە - لە ڕاستیدا - چەند بەروبوومێکن لە درەختی بەدیهاتووانەوە شۆڕ بوونەتەوە.

بەڵام بە پـێچەوانەوە، واتە گەر نهێنیـی "تەوحیـد" لە ئـارادا نەبێـت، ئەوا درەوشانەوەی ئەو "کەسـایەتی" و "تەنیـایی" و "سـیما" و "دەستنیشـانکاری"یە هێندەی فراوانیی گەردوون فراوانی بەدەست دەهێنێت و بڵاو دەبێـتەوە و، ئیـتر وردە وردە دەتوێتەوە و لەبەرچـاودا ون دەبێـت و نامێنێـت. دیـارە ئەو کـاتەش مەگەر تەنها بۆ دڵانی خاوەن بەسیرەت و بینایی یەکجار فراوان، دەنـا لە لایەن هیچ کەسێکەوە نابینرێن و بەرچاو ناکەون. چونکە "مەزنیـی گەورەیی"(عظمـة الكبرياء) پەردەیەك بەسەر خۆیـدا دادەداتەوە کە ئیـتر "دڵ"ی هەمـوو کەسـێك نەتوانێت ببینێت.

بەم جۆرە و بەهـۆی نهێنیـی تەوحیـدەوە، زۆر بە ڕوونی و ئاشـکرایی و لە ڕێـی سـەرنجدانەوە لەو زینـدەوەرە جوزئییـانە، دەردەکەوێـت و دەزانرێـت کە بەدیهێنەرەکەیان دەیانبینێت و ئاگای لە حاڵیانە و گوێی لە دەنگیانە و چۆنیشـی بوێت هەر بەو چۆنێتییە وێنە و شێوەیان دەنەخشێنێت..

ئیـتر لە پشـت پەردەی "بەدیهێـنراوی" و "دروسـتکراوی"ی زینـدەوەرەوە: "بەرجەستەبوون" و "دەستنیشانکاری"یەکی مەعنەوی لە پـێش چـاوی بینـایی و بەسـیرەتی ئیمانـدا دەردەکەوێـت کە لە لایەن بەتوانـایەکی خـاوەن ئیختیـار و بیستن و زانین و بینینەوە ئەنجام دەدرێت. بە تـایبەت لە نێـوان زیندەوەرانـدا لە

پشت پەردەی "بەدیهاتوویی"مرۆڤەوە زۆر بە ڕوونی و بەهۆی نهێنیـی ئـیمان و تەوحیدەوە ئەو بەرجەستەبوونە مەعنەوی و دەستنیشانكارییە بەرزە دەبینرێـت. چـونكە نمـوونەی بناغەكـانی ئەو بەرجەسـتەبوون و دەستنیشـانكارییەی "تەنیایی"ی خوای گەورە لە مرۆڤدا هەیە، كە بـریتین لە: زانسـت و توانسـت و ژیان و بیستن و بینین و واتاكانی تری هاوچەشنیان. ئیتر ئەم نموونانە ئاماژە بۆ ئەو بناغانە دەكەن..

چونكە - بۆ نموونە - ئەو كەسەی كە هەستی بینینی لەنـاو سـەری مرۆڤـدا داناوە، ئەو هەسـتی بینیـنە و بینراوەكـانی ئەو بینیـنەش - كە ئەمەش واتـایەكی وردە - دەبینێت ئنجا هەستی بینین دەبەخشێت! بەڵێ، ئەو چاویلكەسـازەی كە چاویلكەیەكت بۆ دروست دەكات لە پێشدا گونجاویی چاویلكەكە بۆ چـاوی تـۆ دەبینێـت و لـێكی دەداتەوە ئنجـا بـۆت دروسـت دەكـات.. هەروەهـا ئەو كەسەی كە هەستی بیستنت بۆ بەدی دەهێنێت بـێ هـیچ گومانێـك ئەو شـتانە دەبیستێت كە گوێی مرۆڤ دەیانبیستێت، ئنجا ئەو هەستە بەدی دەهێنێـت و بە مرۆڤی دەبەخشێت.. بەم جۆرە پاشماوەی سیفەتەكانی تر بۆ سەر ئەمانە قیـاس بكە و بەم پێیە لێكیان بدەرەوە.

هەروەها مرۆڤ نەخشونیگار و درەوشـانەوەكانی نـاوە جوانەكـانی خـوای گەورەی تێدایە. كەواتە مرۆڤ بەم نەخشونیگار و درەوشانەوانە شایەتی لەسـەر ئەو واتا خاوێن و موقەددەسانە دەدات.

هەروەها مرۆڤ بە لاوازی و دەستەوسانی و هەژاری و نەزانینـی خـۆی، بە شێوەیەكی تر ئەرك و ڕۆڵی ئاوێنەیەك ئەنجـام دەدات. چـونكە بەم سـیفەتانەی خۆی شایەتی لەسـەر سـیفەتەكانی ئەو كەسـە دەدات كە بەزەیـی بە لاوازی و هەژارییەكەیدا دێـتەوە و بەهانـای دەستەوسـانی و كـۆڵەوارییەكەیەوە دەڕوات. واتە شـایەتی لەسـەر توانسـت و زانسـت و ویسـت و سـەرجەم سـیفەتە شكۆدارەكانی تری خوای گەورە دەدات.

كەواتە بەهۆی نهێنیی تەوحیدەوە هەزار و یەك ناوی جوانی خوای گەورە لەوپەڕی بازنەكانی "زۆری" و لە جوزئییاتە یەكجار پەرتەوازەكان و لەو نامیلكە بچووكانەشدا كە پێیان دەوترێت "زیندەوەران"بە چڕوپڕی كۆ دەبنەوە و، ئنجا زۆر بە ڕوونیش بەهۆی نهێنیی تەوحیدەوە دەخوێنرێنەوە. بۆیە كردگاری دانا گەلێ بە زۆری نوسخەی زیندەوەران دەگرێتەوە، بە تایبەت وردیلەكانیان كە بە چەندین شكڵ و شێوەی جۆراوجۆر زۆریان دەكات و بە هەموو لایەكدا بڵاویان دەكاتەوە.

ئەو شتەی كە منی بەرەو ڕاستیی ئەم "بەروبوومی یەكەم"ە دایەبەر و منی گەیاندە ئەم ڕاستییە، هەست و نەستێكی تاموچێژی تایبەتیی خۆم بوو كە بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

لەبەر ئەوەی سۆزێكی پەرەسەندووی زیاد و شەفەقەتێكی لەڕادەبەدەرم تێدایە، گەلێ بەزەییم بە حاڵی زیندەوەراندا بە تایبەت خاوەن هەستان بە تایبەت تر مرۆڤ و لە نێوان ئەوانیشدا بە تایبەت ستەم لێكراوان و گیرۆدەبووانی دەستی بەڵا و موسیبەتەكاندا دەهاتەوە و، حاڵی ئەوان سۆز و شەفەقەتی منی دەهەژاند و دڵی دەگووشیم و ئازاری دەدام..

لە ناخی دڵمەوە دەموت: ئەو یاسا بەردەوامانەی كە لە جیهاندا دەست بەكارن گوێیان لە گیروگرفتەكانی ئەو هەژار و بێ نەوا و دەستەوسانانە نییە. هەروەك توخمەكان و ڕووداوە كەڕ و لاڵ و زاڵەكانیش هاوار و گریانی ئەوانە نابیستن. ئایا ئیتر هیچ كەسێك نییە كە بەزەیی بەم حاڵە پەرێشانەیاندا بێتەوە و فریای كاروباری تایبەتیی ئەوانە بكەوێت؟ گیانم لە ناخی خۆیدا ئەم هاوارەی دەكرد. هەروەها دڵم بە هەموو هێزێكیەوە دەنگی لێ هەڵدەبڕی و دەیوت: ئایا خاوەنێكی ڕاستەقینە و بەكەرەم نییە سەرپەرشتیی ئەو بەندە یەكجار جوان و ڕەنگین و ماڵ و سامانە تەواو بەنرخ و خۆشەویستە یەكجار موشتاق و منەتبارانە بكات؟

وەڵامی تێروتەسەلی ئەوتۆ کە مایەی دڵنیایی و ئاسوودەیی و قەناعەتی تەواو بێت و داد و فریادی "گیان" و هاواری "دڵ"م هێور بکاتەوە، بریتییە لەوەی کە:

ئەو بەندە خۆشەویستانەی وا لە ژێر پاڵەپەستۆی یاسا گشتییەکانی بەخشندەی میهرەبانی شکۆمەندا دەناڵێنن و هاوار لەدەست هێرش و لێدانی ڕووداوەکان دەکەن، خواوەندی میهرەبان بەهۆی نهێنیی تەوحید و لە سەرووی ئەو یاسایانەوە چەندین چاکەکاری و فریاگوزاری و پەروەردگاریتیی تایبەتی و ڕاستەوخۆ بە هانا و فریای هەموو شتێکەوە دەنێرێت و پێیان دەبەخشێت و، هەر بە زاتی شکۆمەندی خۆیشی کاروباری هەموو شتێك ڕایی دەکات و، گوێ لە سکاڵای هەموو خاوەن گیروگرفتێك دەگرێت و، هەر ئەو خواوەندە میهرەبانەشە کە خاوەنی ڕاستەقینەی هەموو شتێکە.

لەو کاتەوە کە ئەم نهێنییەم لە قورئان و نووری ئیمانەوە دەست کەوت و پێم زانی، هەستم بە شادمانی و خۆشحاڵییەك کرد کە سەرانسەری گیان و هەناومی گرتەوە و، ئەو نائومێدییە ڕەش و تاریکەش نەما و پشتی هەڵکرد.

ئیتر هەموو زیندەوەرێك لە پێش چاومدا لە ڕووی پەیوەندییەوە بەو خاوەنە شکۆمەندەی و بەندایەتی بۆکردنی، هەزاران پلەی بەرزی گرنگی و نرخ و بەهای بەدەست هێنا. چونکە هەموو کەسێك شانازی بە شەرەف و پلە و پایەی گەورەکەی و ئەو کەسەوە دەکات کە سەر بەوە، هەروەك شانازی بە ناوبانگەکەیەوە دەکات. کە ئەمەش عیززەت و فەخر و شانازی لە لای خۆیشی بەرهەم دەهێنێت.

بێگومان ئەم نووری ئیمانەی کە ئەو نیسبەت و پەیوەندی و بەندایەتییەی پەرە پێ داوە، وا لە مێروولە دەکات کە بە هێزی ئەو نیسبەت و پەیوەندییە بەسەر فیرعەونێکدا زاڵ ببێت. تەنانەت بواری ئەوەی هەیە کە شانازییەك بەو پەیوەندییەوە بکات کە هەزار جار لە شانازیی ئەو فیرعەونە بێئاگایە زیاتر بێت

کە خۆی بە سەربەست و بێ خاوەن دادەنا و شانازیی بە فیرعەونەکانی باپیری و موڵکی میسرەوە دەکرد کە فەخر و شانازییەکی وەهایە لە دەرگای گۆڕدا تاریکایی بەسەردا دێت و تەواو دەبێت..

هەروەها مێشوولە دەتوانێت بە پیشاندانی شەرەفمەندیی ئەو پەیوەندییە، فەخر و شانازیی ئەو نەمرووده لەناوبەرێت کە لە سەرەمەرگدا بۆی بوو بە خەجاڵەتی و سزا و ئازار.

بەم جۆرە ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ (لقمان:١٣) تێمان دەگەیەنێت کە "شیرك" ستەمێکی ئابڕووبەری لەخۆدا هەڵگرتووە. چونکە لەبەر ئەوەی دەستدرێژی بۆ سەر مافەکانی هەموو بوونەوەرێك و سووکایەتیش بە شەرەف و کەرامەتی دەکات، ئەوا تاوانێکی هێندە گەورە و چەپەڵە کە جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچ شتێکی تر ئەم تاوانی شیرکە پاك ناکاتەوە.

* * *

### ❖ دووهەم بەروبوومی تەوحید

هەروەك بەروبوومی یەکەم ڕووی لە زاتی موقەددەسی پەروەردگاری هەموو جیهانەکان بوو، ئەم بەروبوومەش ڕووی لە زات و ماهییەتی گەردوونە.

بەڵێ، هەر بەهۆی نهێنیی تەوحیدەوەیە کە:

کەماڵات و تایبەتمەندییەکانی گەردوون دێنە دی و.. کارمەندی و ئەرکە بەرز و بڵندەکانی بوونەوەران دەزانرێن و.. ئەنجامی بەدیهێنانی بەدیهاتووان دەردەکەوێت و.. گرنگیی دروستکراوان دەزانرێت و.. ئامانجە خواییەکانی ناو ئەم جیهانە ئاشکرا دەبن و.. حیکمەتی بەدیهێنانی زیندەوەران و نهێنیی بوونی خاوەن هەستان دەردەکەون و.. ڕووە خەندان و جوانەکانی میهرەبانی و حیکمەتەکان لە پشت سیمای گرژ و تووڕەی ئەم ڕووداوە زاڵ و

ڕووخێنەرانەی ناوەندی ئاڵوگۆڕە سەرسووڕهێنەرەکان، دەبینرێن و.. دەزانرێت کە ئەم بوونەوەرانە لە پشت ئاسۆی فەنا و نەمانەوە ئاوا دەبن و ئەم جیهانە بینراوە بەجێ دەهێڵن، لە بریی خۆیان گەلێ جۆری "بوون"ی وەك ئەنجام و ناوەرۆك و ماهیيەت و گیان و تەسبیحاتەکانیان بەجێ دەهێڵن، ئنجا لەم جیهانە کۆچ دەکەن.

هەروەها بەهۆی نهێنیی تەوحیدەوە دەزانرێت کە:

سەرانسەری گەردوون کتێبێکی صەمەدانیی ئەوتۆیە گەلێ واتای زۆر و زەبەندە و قووڵی لەخۆ گرتووە و.. سەرجەمی بوونەوەرانیش کۆمەڵە نووسراوێکی خواوەندن کە لەوپەڕی ئیعجازدان و.. هەموو چین و دەستە و تاقمەکانی بەدیهاتووانیش چەند سەربازێکی پەروەردگارین کە لەوپەڕی سام و شکۆ و ڕێکوپێکیدان و.. هەموو تیرە و هۆزێکی دروستکراوانیش هەر لە میکرۆب و مێرووولەوە تا دەگاتە کەرکەدەن و هەڵۆ و هەسارە گەڕۆکەکان هەموویان کارمەندی سەرقاڵ و لێبڕاون بۆ کارەکانیان کە بە فەرمانی پادشای ئەزەلی ئەنجامی دەدەن.

هەروەها بەهۆی نهێنیی تەوحیدەوە هەموو شتێك لە ڕووی نیسبەت و پەیوەندی کردنیەوە بە خواوەندەوە و لە ڕێی ئەنجامدانی ئەرکی "ئاوێنە"وە، بەهایەکی هێندە گەورە بەدەست دەهێنێت کە هەزاران جار لە نرخ و بەهای خۆی زیاتر بێت و.. نهێنیی داخراوی ئەو پرسیارە سەرسووڕهێنەرانەش دەردەکەوێت کە دەڵێن: لافاوی بوونەوەران و کاروانی بەدیهاتووان لە کوێوە دێن؟ بەرەو کوێ دەڕۆن؟ بۆچی هاتوون و چ کارێك دەکەن؟

هەموو ئەمانەش بە بێ نهێنیی تەوحید نایەنەدی. چونکە ئەگەر تەوحید نەبوایە هەموو کەمالات و تایبەتمەندییە ناوبراوەکانی گەردوون پەردەی تاریکییان بەسەردا دەهات و ئەو حەقیقەتە بەرزانە هەڵدەگەڕانەوە و دەبوون بە شتانی دژی خۆیان.

بەم جۆرە دەرکەوت کە شیرك و کوفر تاوانێکی هێندە چەپەڵن دەستدرێژی بۆ سەر کەماڵاتی بوونەوەران و مافە بەرزەکانیان و هەموو حەقیقەتە بڵندەکانیان دەکەن. بۆیە بوونەوەران و تەنانەت ئاسمانەکان و زەویش ڕق و قینیان لە ئەهلی شیرك و کوفر دەبێتەوە و توخمەکانی گەردوونیش بۆ لەناوبردنی کافران و موشریکان یەکدەگرن. ئەوەتا قەومی حەزرەتی نووح - دروودی لەسەر بێت - نوقمی ئاو دەکەن و، قەومی عاد و سەموودیش سزا دەدەن و، فیرعەون و موشریکانی هاوچەشنیشی بە خنکاندن و نغرۆکردن لەناودەبەن. تەنانەت دۆزەخیش ڕقێکی هێندە توندوتیژیان لێ هەڵدەگرێت کە وەختە لە ڕقدا لەتوپەت ببێت، وەك دەقی ئایەتی پیرۆز فەرموویەتی:

﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ﴾ (الملك:٨).

بەڵێ، "شیرك" سووکایەتیکردنێکی چەپەڵە بە گەردوون و دەستدرێژییەکی گەورەیە لەسەری و داشکاندنێکی زۆرە لە بەها و شان و شکۆی، چونکە ئینکاریی حیکمەتی بەدیهێنان دەکات و دان بە کارمەندی و ئەرکە مەزنەکانی بەدیهاتوواندا نانێت.

لە نێوان هەزاران نموونەی ئەم ڕاستییەدا ئاماژە بۆ تەنها یەك نموونەیان دەکەین:

لە ڕوانگەی نهێنیی تەوحیدەوە "گەردوون" وەك مەلائیکەتێکی بەرجەستەی هێندە گەورە وایە کە سەدان هەزار تەنانەت بە ئەندازەی ژمارەی جۆرەکانی بوونەوەران "سەر"ی ببێت. هەریەك لەو سەرانەش سەدان هەزار بەڵکو بە ژمارەی دانە دانەی ئەو جۆرانە دەمی ببێت. هەموو یەکێك لەو دەمانەش سەدان هەزار، بەڵکو بە ژمارەی ئامێر و ئەندامەکانی دانە دانەی ئەو جۆرە بوونەوەرە و بە ژمارەی بەش و ئەندام و خانەکانیشی زمان لەو دەمانەدا ببێت..

جا ئەم گەردوونە زەبەلاح و بەدیهێنراوە سەیر و مەلائیکەتە گەورەیە، بە ئەندازەی ئەم زمانە لەژمارەبەدەرانە تەقدیس و تەسبیحاتی کردگاری شکۆمەند

دەکـات. کەواتە گەردوون لە پـلەیەکی یەکجـار بەرز و مەزنی بەنـدایەتیی وەك بەندایەتییەکەی حەزرەتی ئیسرافیلدایە، دروودی لەسەر بێت.

هەروەها ئەم گەردوونە بەهۆی نهێنیـی تەوحیـدەوە وەك کـێڵگەیەك وایە کە گەلێ بەروبووم و داهاتی تابڵێی زۆر بۆ جیهـانی دوایـی و مەنزڵگاکـانی ئەوێ ئامـادە دەکـات و.. بە وێـنەی کـارگەیەکی گەورە وایە کە پێداویسـتییەکانی چەندین چین و دەستەی ناو خانەی بەختەوەری ئامادە دەکات لەو کـردارانەی مـرۆڤ کە پـڕن لە داهاتەکـانی تەمەن و کردەوەکـانی و.. وەکـو ئـامێرێکی سینەمایی گەورە وایە کە سـەدان هەزار ئـامێری وێنەگرتنـی لـێ بـووبێتەوە بـۆ گرتنی چەند وێنەیەکی دنیا و پێش‌چاو خسـتنیان لە چەنـد نیگـار و دیمەنـێکی هەمیشـەییدا لە پـێش چـاوی خەڵکـانی جیهـانی مـانەوە و ئەهـلی شـهوودی بەهەشت.

لە کاتێکـدا کە گەردوون بەهـۆی نهێنیـی "تەوحیـد"ەوە لەسـەر ئەم شـێوە سەرسووڕهێنە و بە وێنەی مەلائیکەتێکی بەرجەستەی گوێڕایەڵ و خاوەن ژیان دەردەکەوێت، کەچـی "شـیرك" دەیکـات بە چەنـد پـارچەیەکی وشـکی لەیەك دابڕاوی لاوازی بێ گیان و بێ ژیان و بێ مانەوە و بێ ئەرك و کارمەندی و بـێ واتا و لەناوچـوو و بەرباد، بە شـێوەیەك کە لە نـاوەندی تاریکییەکانی عەدەم و مەترسیی ڕووداوە بێ نرخەکان و ئاڵوگۆڕەکانـدا تەپـاوتلی پـێ کەوتـووە و بەر دەبێتەوە. "شـیرك" ئەم کـارگە مەزن و زۆر سـوودمەندەی گەردوون دەکـات بە شـتێکی لەکـارکەوتووی بێسـوود و تێکەڵـوپێکەڵ و یـاریی دەسـتی ڕێـکەوتە کتوکوێرەکان و سروشتی کەڕوکاس و هێزە کوێر و نابیناکـان و، دەیگۆڕێـت بە ماتەمینگایەکی بە ئازار بۆ هەموو زیندەوەران.

بەم جۆرە دەردەکەوێت کە چۆن "شیرك" دەبێت بە مـایەی چەنـدین تـاوانی گەورە گەورە! ئایـا ئیـتر، لەگەڵ ئەوەشـدا کە - بە ڕواڵەت - تەنهـا یەك تـاوانە، شایانی سزای هەتاهەتایی دۆزەخ نییە؟! خوای گەورە چەندە ڕاستی فەرمووە:

﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ (لقمان:١٣)!

بە هەرحاڵ، کۆمەڵە پەیامی "سراج النور" ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم بەروبوومی دووهەمەی لەگەڵ بەڵگە دووپاتبووەکانی تێدایە. بۆیە لێرەدا ئەم ڕاستییە دوور و درێژەمان کورت کردەوە.

ئەو شتەی کە منی بەرەو ئەم بەروبوومی دووهەمە دایەبەر و منی گەیاندە ئەو بەروبوومە، هەست و نەستێکی سەرسووڕهێن و چێژێکی نامۆ بوو کە بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

لە ڕۆژێکی وەرزی بەهاردا سەرنجم لەم بوونەوەرانە دەدا کە ڕووی زەوییان پڕ کردووە و کاروان لە دوای کاروان دێن و دەڕۆن و سەدان هەزار نموونەی حەشر و نەشر پێش چاو دەخەن.. بینیم ئەم بوونەوەرانە، بە تایبەت زیندووەکان و لەناو ئەوانیشدا زیندەوەرە بچووکەکانیان هەر هێندەی پەیدا دەبن یەکسەر ون دەبن و لە بەرچاودا نامێنن.. ئیتر بەم جۆرە دیمەنەکانی مردن و نەمان لە ناوەندی کارایەکی بەردەوامدا بە دوای یەکتردا دێن و دەڕۆن و، ئەم دیمەنانەش لە بەرچاومدا هێندە ئازاربەخش و خەمناك دەرکەوتن کە دەستکاریی ژێی هەست و نەستەکانی منیان کرد و نەرمیی دڵیان ورووژاندم، تەنانەت خستیشیانمە گریان! خۆ هەرکات مردنی ئەو زیندەوەرە خنجیلە و ناسکۆڵانەم دەبینی، ئازار دڵی دەگووشیم و بەدەم خەم و پەژارەوە ئاخ و داخم هەڵدەڕشت و هەستم بە کڵپەیەك دەکرد کە لە ناخی گیانمەوە بڵێسەی دەدا، بە ڕادەیەك کە ئەو ژیانەش ئەمە ئەنجامی بێت لە پێشچاومدا بوو بە ئازارێکی سەختی لە هی مردن گەلێ زیاتر!

هەروەها لە جیهانی ڕووەك و زیندەوەرانیشدا بینیم کە ئەو زیندەوەرە یەکجار جوان و خۆشەویستانەی لەوپەڕی وردەکاری و ناوازەییدا بەدی هێنراون، هەر هێندەی بۆ چەند چرکە و ماوەیەکی کەم چاو لەسەر ئەم ژیانە دەکەنەوە و ئەم ڤیستیڤاڵە گەردوونییە مەزنە دەبینن، یەکسەر دەڕۆن و نامێنن!

هەر كە ئەم حاڵەتەم بینی لە خەم و خەفەتدا جەرگم پارەپارە بوو و ویستی بە گریانەوە سكاڵا بكات و، وتی: كەواتە بۆچی ئەمانە هاتنە ناو ئەم جیهانە و بۆچی بە خێرایی و بێ ئەوەی تیایدا بمێننەوە دەڕۆن و كۆچ دەكەن؟

بەم جۆرە دڵم گەلێ پرسیاری ترسناكی بەرامبەر ڕۆژگار و چارەنووسەكان دەردەبڕی. چونكە ئەم چەشنە بەدیهاتووە ناسكۆڵانە بێ هیچ سوود و ئامانج و ئەنجامێك دێن و دەڕۆن و بە خێراییەكی لەڕادەبەدەر لەناو دەبرێن، لە كاتێكدا كە بایەخدانێكی گەورە و وردەكارییەكی لەڕادەبەدەر و ناوازە لە بەدیهێنانیاندا دەبینین و، جگە لەمانەش هەموو ئامێر و كۆئەندامێكی پێویستیان بۆ دابین كراوە و بۆ پەروەردە و گەشەكردنیشیان خراونەتە ژێر چاودێرییەكی تەواوەتییەوە و بە ڕێكوپێكی كاروباریان ڕایی دەكرێت و لە جوانترین شێوەشدا بەدی دەهێنرێن. كەچی دوای ئەمە دەبینین لەتوپەت دەبن و لەناو دەچن و دەخرێنە ناو تاریكستانی عەدەمەوە!

هەر كاتێك سەرنجم لەم دیمەنە ئازاربەخشە دەدا، هەموو هەست و نەستە ناسكەكانم كە شەیدای گشت جۆرەكانی جوانی و كەماڵن و تاسەمەندی شتانی بەنرخ و بەهان، دەنگی هاوار و هادیان لێ هەڵدەسا و دەیانوت:

بۆچی بەزەییەك بەم بەدیهاتووانەدا نایەتەوە؟ ئەم فەنا و نەمان و ئاڵوگۆڕە سەرسوڕهێنەرانە لە كوێوە دێن و، بۆچی بەسەر ئەم خنجیلە و ناسكۆڵانەدا زاڵ دەكرێن؟

هەر ئەوەندەی ئەم ڕەخنە و ئیعتیرازە ترسناكانە ڕوویان كردە قەدەر، چونكە چەند حاڵەتێكی خەمناك و ئازاربەخش بە ڕووی ڕواڵەتیی موقەددەراتەكانی لەمەڕ ژیانەوە دەبینرێن، ئەوا یەكسەر نووری قورئان و ئیمان و تەوحید و سۆز و بەزەیی خواوەندی میهرەبان بە هانامەوە دەهاتن و یارمەتییان دەدام و، ئەو تاریكاییانەیان بۆ ڕووناك دەكردمەوە و هەنسك و حەسرەت و گریانی منیان دەگۆڕی بە خۆشحاڵی و شادمانی و، لە بریی خەم و خەفەت و ئاخ و

ئۆف زمانی منیان بە: "ماشاءَ اللّه، بارك اللّهّ" دەخستەگۆ، بە ڕادەیەك کە هانیان دام لەبەرخۆمەوە بڵێم: "الحمدُ للّهِ علیَ نورِ الإیمان". چونکە بەهۆی نهێنیی تەوحیدەوە بۆم دەرکەوت کە:

هەموو بوونەوەرێك، بە تایبەت هەموو زیندەوەرێك، گەلێ ئەنجامی زۆر و سوودی جۆراوجۆری تێدایە.

بۆ نموونە:

هەموو زیندەوەرێك، با بڵێین ئەم گوڵەڕەنگینە یان ئەم مێرووە بێت، لە ڕاستیدا پارچە هۆنراوەیەکی بچووکی خواییە کە هێندە واتای قووڵ و زۆری لەخۆ گرتووە چەندین خاوەن هەست و نەستی بێ سنوور و لەژمارەبەدەر بە چێژ و لەزەتێکی تەواوەتییەوە موتاڵای دەکەن و دەیخوێننەوە.. هەروەها موعجیزەیەکی بەنرخی توانستی خواوەندە و.. تابلۆیەکە دانستی خواوەندی تێدا ڕادەگەیەنرێت، چونکە بەوپەڕی سەرنج ڕاکێشییەوە وردەکارییەکانی سنعەتی کردگاری مەزن لە بەردەم نرخشناس و قەدرزانە لەژمارەبەدەرەکاندا پێش‌چاو دەخرێن.

بەم جۆرە دەردەکەوێت کە مەزنترین ئەنجامی بەدیهێنانی زیندەوەر: بەهرەمەندبوونیەتی بە دەرکەوتنی لە بەردەم بینینی بەدیهێنەرە شکۆمەندەکەیدا کە دەیەوێت هەر بۆ خۆی جوانیی سنعەت و بەدیهێنانەکانی و جوانیی درەوشانەوەی ناوەکانی لەناو ئاوێنە بچووکەکاندا ببینێت. جگە لەمەش ئەرکێکی بەرزی ئەستۆی بەدیهێنانی زیندەوەر (وەك لە مەکتووبی بیست و چوارەمدا باس کراوە) لەوەدایە کە بە پێنج ڕوو ئەرکی دەرخستنی ئەو پەروەردگارێتییە ڕەها و کەماڵەی خواوەند ڕابپەڕێنێت کە ئەم کاراییە ڕەها و دەستبەکارەی گەردوون داخوازیەتی.

کەچی هەرچەند زیندەوەر ئەم چەشنە سوود و ئەنجامانەی هەیە، بینیم گیانەکەی خۆی - گەر گیاندار بێت - بەجێ دەهێڵێت و شێوە و هەویەکەی لە

زەینەکـان و سـەرجەمی لەوحە پارێزراوەکانـدا بەجـێ دەهێڵێـت و، یاسـاکانی ماهییەتی خۆی و جۆرێکی ژیـانی ئاینـدەی لە گەرا و تۆوەکانیـدا دادەنێـت و، تایبەتکاریی ئەو کەماڵ و جوانییەش کە وەك ئـاوێنە دەری خسـتن، بە جیهـانی غەیب و بازنەی ناوەکان دەسـپێرێت، ئنجـا دوای هەمـوو ئەمـانە دەڕواتە ژێـر پەردەی نەمـان و، خۆشـحاڵ و شـادمانە بەو مـردنە ڕواڵەتییـەی کە لە واتـا و ناوەرۆکدا دەست هەڵگرتنە لە کار و تەسریح بوونە لە ئەرکەکـانی سەرشـان و، تەنها لە پێش‌چاوی ڕوانینەکانی دنیادا ون دەبێت.

بەڵێ، ماهییەتی زیندەوەرم بەم جۆرە بینی. بۆیە لە ناخەوە وتم: "الحمدُ للّه".

بێگومان ئەم هەموو جۆرە جوانییانەی کە بە گشـت چینەکـانی گەردوونەوە دەبینرێن و، لە هەموو جۆرەکانی دەستە و تیرەکانی بوونەوەراندا دەردەکەون کە ڕەگ و ڕیشەیان بە هەموو لایەکدا بڵاو کردووەتەوە و لەسەر چەندین بنـاغەی بەهێزی توندوتۆڵ دامەزراون و لەوپەڕی درەخشانیدان..

بێگومـان ئەم هەمـوو جـۆرە جوانییـانە، دەری دەخەن کە ئەو چەپەڵـی و ناشیرینییە بێزلێکراوەی "شیرك" لە حاڵەتی یەکەمـدا داخـوازی بـوو، مەحـاڵە و شـتێکی وەهمیـیە! چـونکە جـوانییەك کە تـا ئەم ڕادەیە بە نـاخی گەردوونـدا ڕۆچووبێت هەرگیز ناگونجێت ناشیرینییەکی ئابڕووبەری تا ئەم پلە ترسـناکەی لە ژێردا بشارڕێتەوە، تەنانەت هەر ناگونجێ ئەو ناشیرینییە لە ئارادا بێت، دەنـا ئەو جوانییە بێ حەقیقەت و بێ بناغە و شتێکی لاواز و وەهمی دەبێت.

بەو واتایەی کە هەرگیزاو هەرگیز "شیرك" دارای حەقیقەت نییە و ڕێگـاشی لێ داخراوە، تەنانەت هەر شـوێنی دەسـت ناکەوێـت لە زەلکـاوە بۆگەنەکانـدا نەبێت. کەواتە شتێکی مەحاڵ و قەدەغەیە.

ئەم ڕاستییە ئیمانییە ناوبراوەشمان - کە ڕاستییەکی شعوورییە - لە گەڵێ پەیامی کۆمەڵەی "سراج النور"دا بە درێژی ڕوون کردووەتەوە، بۆیە لێرەدا بەم ئاماژە پوختە لێی دواین.

* * *

❖ سێهەم بەروبوومی تەوحید

ئەم بەروبوومە ڕووی لە خاوەن هەستان، بە تایبەت گرۆی مرۆڤە.

بەڵێ، بەهۆی نهێنیی تەوحیدەوە مرۆڤ لە نێوان هەموو بەدیهاتوواندا:

خاوەنی کەماڵێکی گەورەیە و.. بەنرخترینی بەروبوومەکانی گەردوونە و.. ناسکترین و کامڵترین بەدیهاتووە و.. بەختەوەرترینی زیندەوەرانە و.. گفتوگۆ لەگەڵ کراوی پەروەردگاری جیهانیانە و.. شایستەی ئەوەیە کە خەلیل و خۆشەویستی ئەو پەروەردگارە بێت. تەنانەت هەموو تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ و سەرجەم ئامانجە بەرزەکانی مرۆڤ پەیوەستن بە "تەوحید"ەوە و بەهۆی نهێنیی "تەوحید"ەوە دێنەدی.

کەواتە گەر تەوحید نەبوایە مرۆڤ دەبوو بە بەدبەختترینی بەدیهاتووان و نزمترینی بوونەوەران و، لاوازترینی زیندەوەران و، خەمبارترین و بە ئازارترینی خاوەن هەستان. چونکە مرۆڤ کوڵەواری و دەستەوسانییەکی نەبڕاوەی لە خۆدا هەڵگرتووە و، چەندین دوژمنی لەژمارەنەهاتووی هەیە و، هەژاری و دەستکورتی و پێویستییەکی بێسنووریشی تێدایە، کەچی لەگەڵ ئەمەشدا ماهییەتەکەی هێندە ئامێر و هەست و نەستی جۆراوجۆری زۆر و زەبەندەی تێدایە کە بتوانێت هەست بە سەد هەزار جۆر ئازار بکات و بە دوای سەدان هەزار جۆری چێژ و لەزەتیشدا بگەڕێت، ئەمە جگە لەوەی کە هێندە ئامانج و

خواست و ئارەزووشی هەیە كە بە هیچ كەسێك نایەنەدی مەگەر بە كەسێك كە فەرمانی لە سەرانسەری گەردووندا جێبەجێ بكرێت!

بۆ نموونە: مرۆڤ حەزێكی توند و بەتینی بۆ "مانەوە" تێدایە. خۆ تەنها ئەو كەسە دەتوانێت ئەم حەزەی بۆ بهێنێتە دی كە بە ئاسانییەكی ڕەها دەستكاریی سەرانسەری گەردوون بكات و، بە وێنەی كردنەوەی دەرگای خانەیەك و داخستنەوەی یەكێكی تر، دەرگای دواڕۆژ لە پاش داخستنی دەرگای خانەی دنیا بكاتەوە.

مرۆڤ هەزاران حەز و ئارەزووی ئیجابی و سەلبیی وەك ئەم حەزی مانەوەیەی تێدایە و، هەر هەمووشیان پەلیان بەرەو ئەبەد و گشت سووچ و كەنارێكی جیهان هاویشتووە. جا هەر تەنها خوای گەورەی تاك و تەنیایە كە جڵەوی هەموو شتێكی بە دەستە و، ئەم حەز و خواستانە هێور و دڵنیا دەكات و دەیانهێنێتەدی و هەردوو زامە قووڵەكەی: "كوڵەواری" و "هەژاریی" مرۆڤ تیمار و چارەسەر دەكات.

هەروەها مرۆڤ گەلێ خواستی ورد و جوزئی و پەنهانی هەن كە تایبەتن بە سەلامەتی و حەوانەوەی دڵی خۆی و، هێندەش ئامانجی هەمەكی و هەمەلایەنگری هەیە كە مایەی مانەوە و بەختەوەریی گیانی ئەون و، هەموو ئەمانەش بە جۆرێكن و لە ڕادەیەكدان كە مەگەر تەنها ئەو خواوەندە بتوانێت بیانهێنێتەدی كە شتانی نەبینراوی لە پەردەی دڵ ناسكتر دەبینێت و بایەخی پێ دەدات و، دەنگی پەنهانی نەبیستراو دەبیستێت و بە هانایەوە دەڕوات و، بە وێنەی ملكەچكردنی سەربازی گوێڕایەڵی فەرمان دەتوانێت زەوی و ئاسمانەكان لە چەندین كارمەندیی گەورە و گرنگدا گوێڕایەڵ و ملكەچ بكات.

هەروەها بەهۆی نهێنیی "تەوحید"ەوە هەموو ئامێر و هەست و نەستەكانی مرۆڤ پلە و پایەیەكی بەرز بەدەست دەهێنن، كەچی بەهۆی كوفر و شیركەوە بەردەبنەوە ناو شیوێكی تابڵێی قووڵەوە.

بۆ نمـوونە: ئەو "ژيـری"يەی كە باشـترين و پێشـكەوتووترينی ئامێرەكـانی مرۆڤە، گەر بە نهێنيی "تەوحيد" بەكار بهێنرێت، ئەوا دەبێت بە كليلێكی هێنـدە بەنرخی ئەوتۆ كە گەنجينە بەرزە خواييەكـان و هەزاران گەنجيـنەی گەردوونی پێ بكـرێتەوە. بەڵام گەر ئەو ژيـرييە لەنـاو قـوڕ و ليتـاوی كـوفر و گومڕاييـدا بگەوزێت، ئەوا دەبێت بە ئامێرێكی ئازاردان و هۆكارێكی بێزاركـردنی مـرۆڤ، لەو ڕووەوە كە سـەرجەم ئـازارە خەمناكەكـانی ڕابـوردوو لەگەڵ مەترسـييە سامناكەكانی داهاتوودا لەسەر مرۆڤ كۆدەكاتەوە.

هەروەها بۆ نموونە: "سـۆز و شـەفەقەت" كە شـيرينترين و ناسـكۆڵەترينی ڕەوشت و خووەكانی مرۆڤە، گەر نهێنيـی "تەوحيـد" بە هانـايەوە نەڕوات ئەوا لەو دۆخەدا نامێنێتەوە و، دەبێت بە قرچە و ئـازاری جـودايی و زامـی پەژارە و بەزەيـی. ئەو كـاتەش دەبێـت بە گيروگـرفتێكی هێنـدە گەورە بـۆ مـرۆڤ كە دايدەبەزێنێتە پلەی نزمی بەدبەختييەوە. بەڵێ، ئەو دايكەی لە خوا بێئاگايە و بـۆ هەتاهەتـايی تاقـانەكەی لەدەسـت دەدات، بە تەواوەتی هەسـت بەم قـرچە و كسپەيە دەكات.

هەروەها بـۆ نمـوونە: "خۆشەويسـتی" كە خۆشـترين و بەتـامولەزەتترين و بەرزترينـی هەسـت و نەسـتەكانی مـرۆڤە، گەر "تەوحيـد" پشـتی بگرێـت و يارمەتيی بدات، ئەم مرۆڤە بچووكە هێندەی گەردوون گەورە و فراوان دەكات، تەنانەت دەيكات بە پادشـايەكی خۆشەويسـت بەسـەر هەمـوو بـوونەوەرانەوە بەگشتی. بەڵام هەر ئەم خۆشەويستييە گەر - پەنا بەخوا - بۆ ناو شيرك و كـوفر بەربێتەوە، ئەوا موسيبەتێكی هێندە گەورەی لێ دەبێـتەوە كە لە هەمـوو كـات و سـاتێكدا دڵـی ئەم مـرۆڤە لاوازە بە جـودايی و لێكـدابڕانی هەتاهەتـايی خۆشەويستە لەژمارەبەدەرەكانی لەتوپەت ببێت، چونكە فەنا و نەمـان هەميشـە دەيانسڕێتەوە و لەناويان دەبات.

بەڵام جۆرەکانی گەمە و گاڵتە و بێئاگایی، کە مـرۆڤ سـڕ و بێئاگـا دەکەن، ناهێڵن مـرۆڤ هەسـت بەم ئـازارە بکـات، چـونکە بە جـۆرێکی ڕواڵەتی و بە چەشنێکی کاتی هەست و نەستەکانی سڕ دەکەن و لەکاریان دەخەن.

جـا ئەگەر لە ڕوانـگەی ئەم سـێ نمـوونەیەوە سـەیری سـەدان ئـامێر و هەسـت و نەسـتی مـرۆڤ بکەیـت و بە هەمـان پێـوەر لێکیـان بـدەیتەوە، ئەوا تێدەگەیت کە تا چ ڕادەیەك "تەوحید" دەبێت بە تەوەرەی کەماڵاتەکانی مرۆڤ.

بەم ئاماژە کورتەی کە بۆ ئەم بەروبوومەی سێهەممان کرد واز لە باسـکردنی ئەم بەروبوومە دەهێنین، چونکە بە تێروتەسەلی و هاودەم لەگەڵ بەڵگەکانیدا لە دووتوێی زیاتر لە بیست پەیامی کۆمەڵەی "سراج النور"دا درێژەی پێ دراوە.

ئەو شـتەی کە منـی دایەبەر و گەیانـدمیە ئەم بەروبـوومە، ئەم هەسـت و نەستەی خوارەوە بوو:

ڕۆژێکیـان لەسـەر لـوتکەی چیـایەکی بەرزدا بـووم و، بەهـۆی بێـداربوونەوەیەکی ڕۆحیـیەوە، کە تاریکـایی بێئاگـایی ڕەوانـدەوە، "گـۆڕ"م بە واتـای تەواوەتی خـۆی و، "مردن"یشـم بە هەمـوو ڕاسـتییەکانیەوە و، "فەنـا و نەمان"یشم بە گشت تابلۆ خەمناك و گریاناوییەکانیەوە لێ دەرکەوت..

لەم کاتەدا "عیشقی مانەوە"ی ڕەگداکوتاوی نـاو نـاخی سروشـتم - وەك لە هەموو کەسێکی تریشدا هەیە - بە تووڕەییەوە بەگژ ئەم دیمەنەدا ڕۆشت و مـلی گوێڕایەڵیی بۆ "نەمان" نەدا! هەروەك لە ئاستی "گۆڕ" و فەنا و نەمانی پێغەمبەرە بەڕێزەکان – درووديان لەسـەر بێـت - و ئەولیـا و پیاوچاکـانی خـاوەن فەزڵ و ڕێـزدا، کە گەلـێ خۆشـم دەوێـن و ڕێـزی گەورە و شـایانیان لـێ دەگـرم و پەیوەندیی توندوتۆڵم لەگەڵیاندا هەیە، ملی کەچ نەکرد..

لەتـاو ئەم حـاڵەتە دژوارە، ڕووم لە هەر شـەش لاکـانم کـرد تـاکو هانـا و یارمەتییان لـێ بەدەسـت بهێـنم، بەڵام هـیچ شـتێکی ئەوتـۆم تیایانـدا دەسـت نەکەوت کە مایەی ئەوە بێت دڵدانەوە و دڵنەواییم پێ ببەخشـێت. چـونکە لای

"ڕابــوردوو"م لە پــێش‌چــاودا بــوو بە گۆڕســتانێکی گەورەی فــراوان و، لای "داهاتوو"شـم تاریـك و ســامناك پــێش‌چـاو کەوت و، لای "ســەرەوە"شم ترســناك و، لای "خــوارەوە" و "ڕاســـت" و "چەپ"یــش چەنــدین حــاڵەتی خەمنــاك و بەئازاریــان پــێ بەخشــیم. لەم ڕوانــگەیەوە شــتانی لەژمــارەبەدەری زیانبەخشم وا دەهاتە پێش‌چاو کە پەلامارم بدەن و هێرشم بۆ بهێنن..

ئا لەم کاتەدا کە من بەم حــاڵەتە ئازاربەخشــەوە گیــرۆدە بووبــووم، نهێنیــی "تەوحیــد" هــات بە هانــامەوە و ئەو پەردەیەی لە بەردەم بینــایی ناخمــدا لادا و ڕاستیی ئەو لایەنانەی پیشاندام و، وتی: ئێستا بڕوانە!

یەکەم جار سەیری ڕووی گرژ و ترسـناکی "مـردن"م کـرد! بینـیم کە مـردن سەبارەت بە ئیمانداران تەسریحکردن و دەست پــێ هەڵگـرتنە لە کــار و ئەرکی سەرشان، "ئەجەل"یــش بلیــت و کــارتی ئەو حەوانــدنەوە و تەسریحکــردنەیە. کەواتە "مــردن" شــوێن گــۆڕین و، دەرگــا و پێشــەکیی ژیــانێکی نەبــڕاوەیە و، دەربــــازبوونە لە بەنـــدیخانەی دنیـــا بەرەو بـــاخ و بێســـتانەکانی ئەودنیـــا و، چاوەڕوانیی کاتی شادبوونە بە حوزووری خواوەندی بەخشـندەی میهرەبـان بە مەبەستی وەرگرتنی پاداشتی کار و، بانگهێشـتێکە بـۆ ڕۆشـتنی ئیمانـدار بەرەو خانەی بەختەوەری.

ئیــتر دوای ئەوەی کە بە تێگەیشـــتنێکی دڵنیــایی بەخشـــی ئــاوا لە "مــردن" تێگەیشتم، خۆشەویستیی "مردن"م لە دڵدا بۆ دروست بوو!

ئنجــا ســەیری "فەنــا و نەمــان"م کــرد. بینـیم ئەو نەمــانە - لە ڕاســتیدا - تازەبوونەوەیەکی بەلەزەتی ئەو شتە فانییانە و شتانی هاوچەشنیانە. کتومت وەك نوێبــوونەوەی دیمەنەکــانی ســینەما و جــوانیی کەف و بڵقەکــانی ئەو ڕووبــارە بەخوڕەمە وایە کە ڕووناکیی خۆر لێی دەدات. لەبەر ئەوە، بە دڵنیاییەوە زانـیم و تێگەیشــتم لەوەی کە فەنـــا و نەمـــانی شـــتانی فـــانی لە ڕاســـتیدا بـــریتییە لە نوێبــوونەوەی درەوشــانەوە ڕەنگینەکــانی نــاوە جوانەکــانی خــوای گەورە و،

ئەنجامدانی ئەرکێکە لە ناوەندی گەشتوگەڕانێك بەناو جیهانی بینراودا دوای هاتنیان لە جیهانی غەیبەوە.. هەروەها چەند ئاوێنە و دەرخەرێکی حیکمەتبەخشی جوانیی پەروەردگارێتیی خواوەندە، چونکە بوونەوەران ئەرکی ئاوێنە دەبینن بۆ نواندنی جوانیی هەمیشەیی پەروەردگار.

پاشان سەیری هەر "شەش لاکان"م کرد. بینیم کە ئەم شەش لایە لە ڕوانگەی نهێنیی "تەوحید"ەوە هێندە ڕووناکن کە وەختە بریسکاییان بینایی چاو ببات. بە ڕادەیەك "کاتەکانی ڕابوردوو" لە پێش‌چاومدا وەك گۆڕستانێکی گەورە نەما، بەڵکو بوو بە "داهاتوویەك کە هەزاران کۆڕی نوورانی و ئەنجومەنی خۆشەویستانیان تێدا گیراوە و هەزاران دیمەنی ڕووناکییان تێدا پێش‌چاو خراوە.

بەم جۆرە و بە چەشنی سەیرکردنم لە ڕوانگەی "تەوحید"ەوە بۆ ئەم دوو ماددەیە، سەیری ڕووی ڕاستەقینەی هەزاران ماددەی ترم کرد و، بینیم جگە لە شادمانی و خۆشحاڵی هیچ شوێنەوارێکی تر لە ناخی مرۆڤدا بەجێ ناهێڵن.

ئەم هەست و چێژە ڕۆحییەم کە لەم بەروبوومی سێهەمەدا باس کرا، هاودەم لەگەڵ بەڵگە گومانبڕە کوللی و جوزئییەکانیدا لە کۆمەڵە پەیامی "سراج النور" بەڵکو لە چل بەش و جێگایدا، بە تایبەت لە سیازدە ئومێدەکەی بریسکەی بیست و شەشەم(پەیامی پیران)دا هێندە ڕوون کراوەتەوە کە پێویستیی بە ڕوونکردنەوەی تر نەهێشتووەتەوە. هەر لەبەر ئەوەیە کە ئەم مەسەلە دوور و درێژە لەم مەقامەدا بە پوختی و کورتی هێنرا.

* * *

# مەقامی دووهەم

## هەندێ لە بەڵگەکانی تەوحید

ئەو بەڵگانەی کە بەوپەڕی بێگومـانی داخـوازی "تەوحیـد" و "یەکتـایی" و "تەنیایی"خواوەندن و، هیچ بوارێك بە "شیرك" و "هاوبەشایەتی" نادەن.. هێندە زۆرن کە لە ژمارە نایەن.

جا لەبەر ئەوەی سەدان، بەڵکو هەزاران دانەمـان لەو بەڵگـانە بە درێـژی لە پەیامەکانی نووردا چەسپاندووە، ئەوا لێرەدا بە پوختی ئاماژە تەنها بـۆ سـێ دانە لەو داخوازییانە دەکرێت.

❏ **خواستی یەکەم:**

ئەم بەدیهـاتووانە - وەك بە چـاو دەبینرێـت - تەنهـا بە سـیفەتە ڕەهاکـانی فەرمانڕەوایەکی دانا و گەورە و کامڵ و، بە ناوە ڕەهاکـان و زانسـتە بێسـنوور و توانستە نەبڕاوەکەی ئەو بەدی دەهێنرێن. هەمـوو ئەو کـارە سـەرتاپا دانسـت و ئـاڵوگۆڕە پـڕ لە بەسـیرەتانەی کە لە گەردوونـدا دەسـت بەکـارن و بە چـاو دەیانبینین، شایەتن لەسەر ئەم دەرەنجامە.

بەڵێ، بە هەستێکی بێگومان، مرۆڤ لەم ئاسەوارانەوە تێدەگات و دەزانێت، تەنـــانەت دەشـــبینێت کە: ئەو بەدیهێـــنەر و کردگـــارە مەزنە خـــاوەنی فەرمـــانڕەوایەتییەکە لە پـلەی "پەروەردگـارێتیی گشـتی"دا و.. گەورەیـی و مەزنی(الكبريـاء والعظمـة)یەکی ئەوتـۆشی هەیە کە لە پـلەی "جەبەرووتی ڕەها"دایە و.. هێندەش خاوەن کەماڵ و بـێ پێویسـتییە بە غەیـری خـۆی هەتـا

پـلەی "خـوایەتیی ڕەهـا" و.. خـاوەنی کـارایی و دەسـتەڵاتدارییەکی هێنـدە بێکۆتاییشە کە سنووری بۆ نییە.

جا فەرمانڕەوایەتی و، گەورەیی و، کەماڵ و، پێویسـت نەبـوون بە غەیـر و، ڕەهایی و، هەمەلایەنگری و، بێکۆتایی و، بێسنووری - هەموویـان - داخـوازی "یەکتایی"ن و دژی شیرك و هاوبەشایەتین.

لە زۆر شوێنی پەیامەکانی نـووردا شـایەتیدانی "فەرمانڕەوایی"مـان لەسـەر تەوحید و یەکتایی چەسپاندووە، وا لێرەدا بەم شـێوەیەی خـوارەوە پـوختەیەکی لێ باس دەکەین:

سروشـتی "فەرمـانڕەوایی" وایە کە داخـوازی سـەربەخۆیی و تەنیـایی و بـوارنەدانە بە دەسـت تێـوەردانی کەسـانی تـر. تەنـانەت ئەم مـرۆڤەی کە بە سروشت و لەبەر دەستەوسانیی خۆی پێویستی بە یارمەتیی کەسانی تری جگە لە خۆیەتی، هەر تەنها بە سێبەرێکی ئەو فەرمـانڕەواییە و لە پێنـاوی پاراسـتنیدا بوار بە دەست تێوەردانی هیچ کەسێك نادات لە کاروبارەکانیدا! بۆیە نابینیت لە وڵاتێکـدا دوو پادشـا و لە پارێزگایەکـدا دوو پارێزگـار و لە ناوچەیەکـدا دوو بەڕێـوەبەر و لە گوندێکـدا دوو کوێخـا بێـت. خـۆ ئەگەر هەر وڵاتێـك دوو پادشای تێدا بێت، ئەوا ڕێسای وڵات تێکـدەچێت و ئـاژاوە و بێیاسـایی بەرپـا دەبێت.

جا ئەگەر "سێبەرێکی فەرمانڕەوایی" لەم مرۆڤە دەستەوسـانەدا کە پێویسـتی بە یارمەتیی غەیری خـۆیەتی، تـا ئەم ڕادەیە ڕێ بە دەسـت تێـوەردانی غەیـری خـۆی نەدات و بەگـژ هاوبەشـایەتیی ئەوانـدا بچێـت، ئەوا بێگومـان فەرمانڕەوایەتیی پەروەردگارێتیی ڕەهای ئەو خواوەنـدەی کە خـاوەنی توانسـتی ڕەهایە و دەستەوسانی و کـۆڵەواری تـوخنی ناکەوێـت، هەرگیـزاو هەرگیـز بە دەست تێوەردان و هاوبەشایەتیی غەیری خـۆی ڕازی نابێـت و، بە سـەختی بە

گڕیاندا دەچێت و، بەوپەڕی توندوتیژی ئەو کەسانە لە دیوانی خۆی دەردەکات کە وەهم و باوەڕی "شیرك"یان لە خۆدا هەڵگرتووە.

ئەو هەڕەشە سەختەی کە قورئانی پیرۆز سەرزەنشتی موشریکانی پێ دەکات و دەست بە ڕوویانەوە دەنێت، لەم ڕاستییەوە سەرچاوە دەگرێت.

* * *

شایەتیدانی "گەورەیی" و "مەزنی" و "شکۆمەندی"ی خواوەندیش لەسەر "یەکتایی"، بە هەمان جۆر و هاودەم لەگەڵ بەڵگە درەخشانەکانیاندا لە پەیامەکانی نووردا ڕوون کراونەتەوە، بۆیە لێرەدا زۆر بە پوختی ئاماژە بۆ ناوەرۆکی ئەو شایەتییە دەکرێت.

بۆ نموونە: هەروەك مەزنیی نووری "خۆر" و گەورەیی ڕووناکییەکەی هیچ پێویستییەك بە ڕووناکییە لاوازەکان ناهێڵێتەوە کە لە نزیك خۆرەوە بە بێ پەردە دابنرێن و، هەرگیز ئەو ڕووناکییە لاوازانە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نابێت، بە هەمان جۆر مەزنی و گەورەیی توانستی خواوەندیش هیچ پێویستییەك بۆ هیچ توانست و هێزێکی تر ناهێڵێتەوە و، هیچ کارێکی بەدیهێنان و هیچ کاریگەرییەکی ڕاستەقینە بە هیچ توانست و هێزێکی تری غەیری خواوەند نادەن، بە تایبەت لەو بەدیهاتووە خاوەن ژیان و هەست و نەستانەی کە سەرجەمی ئامانجە پەروەردگارییەکانیان لە بەدیهێنانی گەردووندا تێدا جەم بووە. چونکە هەرگیز ناگونجێت مەزنی و گەورەیی خواوەند هیچ کام لەو ئامانجانە بۆ غەیری خۆی واز لێ بهێنێت. هەروەها ئەو بارودۆخ و بەروبووم و ئەنجامانەش کە لە زیندەوەرانی جوزئیدان و ئەوانەش کە ئامانجەکانی بەدیهێنانی مرۆڤ و نیعمەتە لەژمارەبەدەرەکانیان تێدا دەردەکەوێت، هەرگیز ناگونجێت بدرێنە پاڵ کەسانی تری غەیری خوای گەورە.

بـۆ نمـوونە: ئەو منەتـزانی و ڕەزامەنـدییە ڕاسـتەقینەیەی کە لە لایەن زینـدەوەرێکەوە لە ئەنجـامی شـیفایەکی جـوزئیی لە نەخۆشـییەك، یـان بـۆ ڕۆزییەکی جوزئی کە پێی دراوە یان بەرامـبەر بە ڕێنمایـیەك کە بـۆ لای خـوای گەورە کـراوە، کە جـگە لە خـوای گەورە لە لایەن کەسی تـرەوە ئەمـانەی پـێ نەبەخشـراوە، ئەو منەتـزانی و ڕەزامەنـدییە تەنهـا پێشـکەش بە خـوای گەورە دەکرێت. لەبەر ئەوە، سوپاسگوزاری و سەناخوانی بۆ غەیری خـوای گەورە بە دەست تێوەردان لە گەورەیی و مەزنیی خواوەند دادەنرێت و، دەسـتدرێژییە بـۆ سەر شکۆمەندی و عیززەتی پەرستراویی ڕەهای خوای گەورە.

* * *

ئاماژەی "کەماڵ"یش بۆ نهێنیی یەکتایی، بە هەمان جـۆر و، هـاودەم لەگەڵ بەڵـگە درەخشـانەکانی، لە پەیامەکـانی نـووردا ڕوون کـراوەتەوە. ئەمەی خوارەوەش پوختەیەکی کورتی ناوەرۆکەکەیەتی:

بەدیهێنـانی ئاسـمانەکان و زەوی، بە ڕوونی و ئاشـکرایی، داخـوازی توانسـتێکی ڕەهـای ئەوتـۆیە کە لەوپەڕی کەماڵـدا بێـت. تەنـانەت ئـامێر و کۆئەندامە سەرسووڕهێنەکانی هەموو زیندەوەرێکیش خوازیاری توانستێکن کە لە کەماڵێکی ڕەهادا بێت. جا ئەو کەماڵەی کە لە توانسـتی ڕەهـادایە و دوور لە کۆڵەواری و خاوێن لە پابەندییە، بـێ هـیچ گومانێـك داواکـاری "یەکتـایی"یە. چونکە بە پێچەوانەی ئەمەوە "ناتەواوی" دووچـاری "کەمـاڵ"ەکەی دەبێـت و، "پابەندی"ش "ڕەهایی"یەکەی دەبەسـتێتەوە و، "نەبڕاوەیـی"یەکەی کۆتـایی پـێ دێـت و، "بەهێزتـرین توانسـت"یش دەخـرێتە خـوارەوە بـۆ ئاسـتی لاوازتـرین دەستەوسـانی و، داخـوازی ئەوەش دەبێـت کە "توانسـتێکی نەبـڕاوە" لە

نەبڕاوەییەکەیدا بە شتێکی کۆتایی پێهاتوو ببڕێتەوە و کۆتایی پێ بهێنرێت! خۆ ئەمەش لە پێنج ڕووەوە مەحاڵی یەك لە دوای یەکی لێ دەبێتەوە.

* * *

شایەتیی "ڕەهایی" و "گشتگیری" و "بێکۆتایی"ش لەسەر "یەکتایی خواوەند" بە هەمان جۆر لە پەیامەکانی "سراج النور"دا بە درێژی باس کراوە، کە ئەمەی خوارەوە پوختەکەیەتی:

هەموو یەکێك لەو کارانەی لەم گەردوونەدا ڕایی دەکرێن، لەو ڕووەوە کە بە شێوەیەکی زاڵ و هەمەلایەنگر ئاسەوارەکەی بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبێتەوە، دەریدەخات کە ئەو کارە کارێکی: گشتگیر و، ڕەها و، بێسنوورە و، هیچ پابەندییەك نایبەستێتەوە. جا شیرك و هاوبەشایەتی کارێك دەکەن کە ئەو گشتگیرییە کەم بکەنەوە و، ئەو ڕەهاییەش ببەستنەوە و ئەو بێسنوورییەش بخەنە سنوورێکەوە. دیارە ئەو کاتەش حەقیقەتی "ڕەهایی" و "گشتگیری" تێکدەچێت! کەواتە دەبێ دەست تێوەردانی "شیرك" و "هاوبەشایەتی" لەو کارە ڕەها و هەمەلایەنگرانەدا مەحاڵ بێت و هەرگیز وجوودی نەبێت.

بەڵێ، ماهییەتی "ڕەهایی" خۆی لە خۆیدا دژی شیرکە! چونکە واتای "ڕەها" تەنانەت گەر لە شتێکی ماددی و سنووردار و کۆتایی پێ هاتووشدا بێت ئەوا بە زاڵبوون و سەربەخۆیی بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبێتەوە، بە وێنەی هەوا و ڕووناکی و گەرمی و تەنانەت ئاویش کە ئەگەر هەرکامیان سیفەتی "ڕەهایی" بەدەست بهێنن ئەوا بە هەموو لایەکدا بڵاو دەبنەوە.

جا مادەم لایەنی "ڕەهایی" گەر لە شتی جوزئییشدا بێت، تا ئەم ڕادەیە و بەم شێوەیە شتانی ماددی و سنووردار زاڵ و بەرفراوان دەکات، ئەوا دەبێ "ڕەهای ڕاستەقینە و کوللی" بە جۆرێکی زاڵ و گشتگیریی تەواوەتی، خاوەنی سیفەتەکانی: نەبڕاوەیی و، دوور لە مادییەت و، بێسنووری و، بێعەیبی و، بێ

ناتەواوی بێت. بە ڕادەیەك كە لە هیچ ڕوویەكەوە بە شیرك و هاوبەشایەتی قایل نەبێت و هیچ گریمانێکی بۆ دانەنرێت.

**بە پوختی:**

"فەرمانڕەوایی"ی هەزاران کاری گشتی، کە لەم گەردوونەدا ڕایی دەکرێن، هەروەها "فەرمانڕەوایی"ی سەدان ناوی جوانی خواوەند کە درەوشانەوە و گەورەیی و کەماڵ و گشتگیری و ڕەهایی و نەبڕاوەییان بە چاو دەبینرێت.. هەر یەك لەم "فەرمانڕەوایی"یانە، بەڵگەیەکی بەهێزی یەکتایی و تەوحیدن.

بۆ نموونە: هەروەك هەر هێزێکی لەڕادەبەدەر و دەراسا کاتێ دەست بە هەر کارایيەك بکات، ئەوا دەست بەسەر هەموو لایەکدا دەگرێت و هێزەکانی تر پەرتەوازە دەکات..

بە هەمان جۆر، هەموو کارێکیش لە کارە پەروەردگاریيەکان و هەموو یەکێك لە درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانی خواوەند، هێزە یەکجار دەراساکانی خۆیان لە ئاسەوارەکانیاندا دەردەخەن. بە ڕادەیەك کە ئەگەر دانستێکی گشتی و دادگەرییەکی ڕەها نەبێت و ئەو هێزانە لە سنووری خۆیاندا ڕابگرێت ئەوا هەموو یەکێك لەو هێزانە بەسەر گشت بوونەوەراندا زاڵ دەبوون. بۆ نموونە: ئەو هێزە هەمەکییەی کە هەموو درەختە پەڵکەکانی سەر ڕووی زەوی بەگشتی بەدی دەهێنێت و کاروباریان دەسازێنێت، هەرگیز درەختە دانە دانە جوزئییەکانی گوێز و سێو و قەیسییش، کە لە نێوان درەختەکانی پەڵکدان و لە تەنیشتیانەوەن، بۆ هیچ هێزێکی تر واز لێ ناهێنێت و، بێگومان ئەوانیش دەخاتە ژێر دەستەڵات و کارسازیی خۆیەوە و بەسەریاندا زاڵ دەبێت.

بەڵێ، ئەم چەشنە هێز و توانستەی کە ڕێکخەر و بەڕێکەری کاروبارەکانە، لە هەموو جۆرەکانی بوونەوەراندا، تەنانەت لە یەك بە یەکیاندا هەست پێ دەکرێت و، دەبینرێت کە ئەم توانستە دەتوانێت بەسەر هەموو بوونەوەران و سەرجەمی شتاندا زاڵ و فەرمانڕەوا بێت.

بێگومان هێزێکی وەك ئەمە هەرگیز بە "هاوبەشایەتی"ی غەیری خۆی ڕازی نابێت و هەرگیز لە هیچ ڕوویەکەوە بوار بە "شیرك" نادات.

هەروەها زۆربەی ئەو پەیوەندی و بایەخەی کە خـاوەنی درەختـێکی بەردار بە خودی درەختەکەی دەدات لە هەمان کاتدا بە بەروبوومەکانیشـــی دەدات کە لە کۆتـــایی پەلەکانیـــدایە و، بە ناوکەکانیشـــــی دەدات کە لەنـــاو دڵـــی ئەو بەروبوومانەدایە، بگرە کە هەر خودی دڵی ئەو بەروبوومانەشـن. بێگومـان گەر ئەو خاوەن درەختە کەسێکی ژیر و هۆشیار بێت هەرگیز ئەم خاوەنێتییەی خۆی بەوە ناشـێوێنێت کە بەروبـوومە شـۆڕبووەکانی ئەو لـق و پەلانە بە شـێوەیەکی هەمیشەیی بکات بە موڵکی کەسانی تر!

جـا هەروەك ئەو درەخـتەی نـاو نمـوونەکە وایە، ئەم درەخـتەش بە هەمـان جۆرە کە ناوی "گەردوون"ی لـێ نـراوە. تەنـانەت توخمەکـان لەم گەردوونەدا لقەکانی ئەو درەخـتە دەنـوێنن و، گەڵا و گوڵەکـانی کۆتـایی ئەو تـوخمانەش ڕووەك و زیندەوەرانن و، بەروبوومەکانی چڵەپۆپەی لق و گوڵ و گەڵاکانیشـی بریتین لە "مرۆڤ". جا مەزنـترین ئامـانجی هەوڵ و کۆششـــی ئەو بەروبـوومە ناوازانە و ئامانجی بەدیهێنانیان بریتییە لە:

"بەندایەتیکردن"ی ئەم مرۆڤە بۆ خـوای گەورە و پێشکەشـکردنی حەمـد و شوکرانەبژێری هەر تەنها بۆ ئەو خوایە. بە تایبەت ئەو شـتەی کە لە ناوکەکـانی ئەو بەروبوومانەوە دەردەچێت کە "دڵ"ی مرۆڤ و هێزی زەین و حافیظەیـانە و پێی دەوترێ: "ظهر القلـب" هەرگیـز ناگونجێـت خـوای گەورە دەسـتیان لـێ هەڵبگرێت بۆ دەست بەسەرداگرتنی غەیری خۆی و کارێـك بکـات لە شـان و شـــــکۆی "مەزنیـــــی پەروەردگـــــارێتی"یەکەی خــــۆی بشـــــکێنێت و "پەرستراوێتی"یەکەشی بەم کارە بشێوێنێت.

هەروەهـا لەبەر ئەوەی ئامـانجە پەروەردگارییەکـان لەو شـتە جوزئییـانەدا کۆبـــوونەتەوە کە لەوپەڕی بـــازنەی "زۆری" و "مومکینـــات"دان، تەنـــانەت لە

جوزئییاتی حاڵەتەكانی ئەو شتە جوزئییانە و جوزئییاتی قۆناغە یەك لە دوای یەكەكانیاندا كۆبوونەتەوە كە دەگەنە مەعبوودییەتی خواوەند و ڕوویان لەو مەعبوودەیە.. هەروەها لەبەر ئەوەی هەموو جۆرەكانی منەتزانی و حەمد و سەنا و شوكرانەبژێری و پەرستن لەو جوزئییاتەوە سەرهەڵدەدەن، ئەوا بێگومان خوای گەورە هیچ كام لەوانە تەسلیمی غەیری خۆی ناكات و بەو تەسلیمكردنە حیكمەتە مەزنەكەی خۆی تێكنادات و بەو تێكدانەش خوایەتییە بەسام و شكۆكەی بەرناداتە خوارەوە. چونكە گرنگترین ئامانجەكانی پەروەردگار لە بەدیهێنانی بوونەوەراندا خۆشەویستكردن و پێناساندنی خۆیەتی لای خاوەن هەستان و، هاندانیانە بۆ ئەوەی هەموو حەمد و سەنا و شوكرانەیەكیان تەنها پێشكەشی ئەو بكەن.

لەبەر ئەم نهێنییە وردە، سەرجەمی ئەو كار و نیعمەتە جوزئی و كوللییانەی كە لەوپەڕی بازنەی "زۆری"دا كۆبوونەتەوە چەشنی: ڕۆزی و، شیفا و، ڕێ دۆزینەوە و، ئیمان و، كار و نیعمەتەكانی تری هاوچەشنیان كە شوكرانە بەرهەم دەهێنن و، دەبن بە مایەی پەرستن و حەمد و سەنا و خۆشەویستی و بەندایەتی.. هەر هەموویان، چاكە و نیعمەتی ڕاستەوخۆی پەروەردگاری هەموو جیهانەكانن و، هی پادشای گشت بوونەوەرانن و، ئاسەواری ڕاستەوخۆی كار و ڕێنمایی ئەون.

بە مەبەستی پێش‌چاو خستن و پیشاندانی ئەمە، قورئانی پیرۆز پەیتا پەیتا "ڕۆزی" و "هیدایەت" و "شیفا" دەداتە پاڵ خواوەندی "واجب الوجود" و، دەریدەخات كە هەریەك لەمانە چاكەكارییەكی تایبەتیی خواوەندن و تەنها لە لایەن ئەو خواوەندەوە بەخشراون و، لە هەمان كاتیشدا زۆر بە توندوتیژی دەست تێوەردانی غەیری خوای گەورە لەو كارە مەزنانەدا پووچەڵ دەكاتەوە[1].

(١) وەك ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِنَّ اللهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ﴾ (الذاريات:٥٨). (دانەر)

بەڵــێ، ئەو "نــیعمەتی ئــیمان"ەی کە خــانەیەکی بەختەوەریــی هەمیشــەیی دەستی مرۆڤ دەخات، تەنها بەخششی ئەو خواوەندە شکۆمەند و بەخشــندە و میهرەبانەیە کە ئەو خانەیەی بەدی هێناوە و "ئیمان"یشــی کردووە بە کلــیلی ئەو خــانەیە، نەك کەسی تــر. چــونکە جــگە لە خــوای گەورە هەرگیــز ناگونجێــت کەسی تــر بەخشــەری ئەم نــیعمەتە هەرە مەزنە بێــت و گەورەتــرین پەنــجەرە دابخات کە بەسەر پەرستراویی خواوەنــددا دەڕوانێــت و گەورەتــرین هۆکــاری گەیشتنیش بەو پەرستراوە بۆ خۆی زەوت بکات.

**پوختەی قسە:**

وردترینی حــاڵەتە جوزئییەکــان و ئەو بەروبوومــانەش کە لە کۆتــایی لــق و پەلەکانی درەختی بەدیهاتوواندایە، لە دوو ڕووەوە شــایەتی دەدەن و ئامــاژە بــۆ تەوحید و "یەکتایی" خواوەند دەکەن:

❍ **یەکەمیان:**

لەبەر ئەوەی ئامانجەکــانی خواوەنــد لە بەدیهێنــانی گەردوونــدا لە حــاڵەتە جوزئییەکاندا کــۆ دەبــنەوە و، دەرکەوتــن و درەوشــانەوە و دەستنیشــان بــوونی زۆربەی ناوە جوانەکانی خواوەندیان تێدا جەم دەبێت و، ئەنجام و سوودەکانی بەدیهێنــــانی بــــوونەوەرانیش لەوانــــدا دەردەکەون.. ئەوا هەریەك لەو حــــاڵەتە جــوزئییانە و لــە ڕوانــگەی ئەم تێــداکۆبوونەوەیە بە زمــانی حــاڵ دەڵێــت: مــن موڵك و کار و ئاسەواری ئەو کەسەم کە سەرانسەری گەردوونی بەدی هێناوە!

❍ **ڕووی دووهەم:**

"دڵ"ی ئەو بەروبوومە جوزئییە و "زەیــن"ی مــرۆڤ کە بەپێــی فەرمــوودەی پیرۆز ناوی: "ظهر القلب"ی[1] لێ نراوە، لە ڕاستیدا پوختە پێڕســتێکی زۆربەی

(١) عن سهل بن سعد رضي الله عنه : (أنَّ امراةً جاءت رسولَ الله ﷺ فقالت يا رسولَ اللــه جئتُ لأهبَ لك نفسي، فنظر إليها رسولُ الله ﷺ فصعد النظر إليها وصوَّبه، ثم طأطأ رأسَه، فلما رأت المرأة أنه لم يقض فيها شيئاً جلست. فقام رجل من أصحابه فقال: يا رسولَ الله إنْ

جۆرەکــانی بەدیهــاتووان و نمــوونەیەکی بچــووکی نەخشــەیانە و، تــۆوێکی مەعنەویی درەختی گەردوونە و ئاوێنەیەکی ناسـکی زۆربەی نـاوە جوانەکـانی خواوەندیشە.

جا بێگومان بڵاوبوونەوەی ئەم دڵ و زەینانە و هاوچەشـنیان کە هەموویـان لەسەر یەك شێوەن و زاڵبوونیـان بەسـەر ڕووی هەمـوو بوونەوەرانـدا، بـۆ ئەو کەسـە دەڕوانێـت کە جـلّەوی ئاسـمانەکان و زەویشی ـ لەدەسـتدایە. چـونکە هەریەکەیـان دەڵێـت: مـن تەنهـا ئاسـەوار ی ئەو خواوەنـدەم.. مـن تەنهـا وردەکاریی ئەو خواوەندەم.

**بە کورتی:**

هەروەك بەروبوومەکـانی درەخـت لە ڕووی سـوودەکانیەوە ڕوویـان لە خاوەنی درەختەکەیە و، لە ڕووی ناوکەکانیشیانەوە ڕوویـان لە هەمـوو ئـامێر و لق و پەل و ماهییەتێکی ئەو درەختەیە و، لە ڕووی ئەو مـۆر و سـکەیەی کە لە دەموچاوی ئەو بەروبوومە و بەروبوومەکانی تری هاوچەشـنی دراوە، ڕووی لە هەموو بەروبوومەکانی تری درەخـتەکەیە و، هەموویـان پـێکەوە دەڵـێن: "ئـێمە لەسەر یەك شێوەین و، لە یەك دەستەوە دەرچووین و، مـوڵکی یەك کەسـین و،

لم يكن لك بها حاجة فزوِّجنيها. فقال: هل عندك من شيء، فقال: لا والله يـا رسـولَ اللـه، قال اذهب إلى أهلك فانظر هل تجد شيئاً، فذهب ثم رجع فقال: لا واللـه يارسـول اللـه مـا وجدتُ شيئاً قال: انظر ولو خاتماً من حديد، فذهب ثم رجع فقال: لا والله يا رسول الله ولا خاتماً من حديد، ولكن إزاري - قال سهل: ما لَه رداءٌ - فلها نصفه فقال رسول الله: ﷺ مـا تصنع بإزارك إن لبسْتَه لم يكن عليهـا منـه شيء، وإن لبسَـتْه لم يكـن عليـك شيءٌ. فجلـس الرجل حتى طال مجلسه ثم قام، فرآه رسول اللهﷺ مولياً فأمر به فدُعي فلما جاء قال: مـاذا معك من القرآن؟ قال: معي سورة كذا وكذا وسورة كذا عدّها، قال: أتقرؤهن عن ظهر قلبك؟ قال: نعم، قال: اذهب فقد ملَّكْتُكَها بما معك من القرآن). البخـاري في المعسـر (٢٣٧/٥) وظهر القلب ( ٨/٧) في كتاب النكاح - باب تزويج المعسر، وفي كتـاب فضـائل القـرآن - باب القراءة عن ظهر القلب والنسائي في كتاب النكاح. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبییەکەوە)

ئەو كەســەی یەك دانەی ئـێمەی بەدی هێنــاوە هەر ئەوە كە - بێگومــان - هەمووومانی بەدی هێناوە..

هەروەك ئەمە وایە.. زینــدەوەریش كە لە كۆتــایی لقەكــانی بــازنەی "زۆری"دایە، بە تایبەت "مرۆڤ"، بە تایبەت لە ڕێی ئەو نیشانە جـوداكەرەوانەوە كە لە ڕوخســاری دراون و لە ڕووی ئەو پێڕســتەی كە لە دڵیــدایە و ئەو ئەنجامانەش كە لە ماهییەتیدان، هەموو ئەمـانە ڕوویـان لەو خواوەنـدەیە كە بە پەروەردگارێتیی شـكۆمەندی خـۆی ئاسـمانەكان و زەویـی ڕاگیـر كـردووە و، شایەتی لەسەر "یەكتایی"ی ئەو دەدەن.

❐ **خواستی دووهەمی یەكتایی:**

ئەم خواستە بریتییە لەوەی كە ئاسانییەكی تا پـلەی "وجـووب" لە یەكتاییـدا هەیە و، چەندین دژواری و گرفتی تا پلەی "نەگونجان"یش لە شیركدا هەیە.

لە چەنـدین پەیـامی كـۆمەڵەی "سراج النـور"دا ئەم ڕاسـتییە بە چەشـنێكی گومانبڕ چەسپێنراوە و بە چەندەها بەڵگەی بەهێزیش دەرخراوە، بە تـایبەت لە مەكتووبی بیستەمدا بە درێژی و لە سەرنجی چوارەمی بریسكەی سیهەمیشدا بە پوختی و بەم جۆرەی خوارەوە ڕوون كراوەتەوە:

ئەگەر كاروباری هەموو شتێك بە زاتی خوای تاك و تەنیـا بسـپێررێت، ئەوا بەدیهێنـانی هەمـوو گەردوون و بەڕێخسـتنی كاروبارەكـانی هێنـدەی ئاسـانیی بەدیهێنانی درەختێك ئاسـان دەبێـت، بەدیهێنـان و پێكهێنـانی درەختێكـیش بە ئەنـدازەی بەدیهێنـانی یەك دانە "بەر" ئاسـان دەبێـت. بەدیهێنـانی بەهـارێكی تەواوەتی و بەڕێوەبردنیشی ئەوەندەی بەڕێوەبردنی یەك تاقە گوڵ ئاسان دەبێت. پەروەردەكردنی یەك جۆر زیندەوەریش كە چەندین دانە دانە و تاك تـاكی زۆری لەخۆ گرتبێت و هەروەها بەڕێخستنی بێ گیروگرفتی كاروبارەكانیـان هێنـدەی ئاسانیی بەڕێوەبردنی یەك دانەیان بەلای ئەو زاتە تاك و تەنیایەوە ئاسان دەبێت.

بەڵام گەر - لە ڕێی شیرکدا - بەدیهێنانی یەك تـاکی ئەو جـۆرە بەدیهـاتووانە بخرێتە ئەستۆی سروشت و هۆکارەکانەوە، ئەوا هێنـدەی قورسـیی بەدیهێنـانی جۆرەکەیان تەنانەت هەموو جۆرەکانی بەدیهـاتووان ئەو کـارە قـورس و دژوار دەبێت. هەروەها بەدیهێنانی یەك دانە "تۆو" بە ئەندازەی بەدیهێنانی درەختەکەی بەڵکو هێندەی سـەد درەخت سەخت و گـران دەبێـت. هەروەهـا بەدیهێنـان و ژیانپێـــدان و بەڕێـــوەبردن و چـــاودێریی یەك دانە درەخـــت و بەڕێکـــردنی کاروبارەکانی، هێندەی بەڕێوەبردنی گەردوون و تەنانەت زیـاتریش سـەخت و پڕ لە کێشە و گیروگرفت دەبێت!

جـــا لەبەر ئەوەی ئەم ڕاســـــتییەمان بەم شـــێوەیە لە "سراج النـــور"دا چەسپاندووە و، خۆشمان زۆریـی بەدیهـاتووان لە ناوەنـدی ئەوپەڕی بـاشی و وردەکاریدا دەبینین، بە ڕادەیەك کە هەموو زینـدەوەرێك - کە وەك مەکینـەیەکی دەراسا وایە - چەندەها ئامێر و کۆئەندامی زۆری تێدایە و، بە زۆرییەکی ڕەهـا و ئاسانییەکی لەڕادەبەدەر و بێ هیچ دەست تێوەردان و تەکەللوفێك و لە مـاوەی چاوترووکاندنێکدا بەدی دەهێنرێن..

مـادەم ئەمە بە چـاوی خۆمـان دەبینـین، ئەوا ئەم دیـاردەیە بە زەرووڕەت و بەداهەت بۆمان دەردەخـات کە ئەو زۆری و ئاسـانییە لە "یەکتـایی"یەوە پەیـدا بـوون و، هـی ئەوەن کە کـاری کەسـێکی تـاك و تەنیـان. چـونکە گـریمانی پـێچەوانەی ئەمە، نەك هەر تەنهـا هەرزانی و زۆری و خێرایـی و ئاسـانی و وردەکاریی ئەو شتە ناهێڵێت، بەڵکـو جـگە لەمـانەش ناتوانرێـت میـوەیەك کە نرخەکەی پێنج پارە بێت، بە پێنجسەد لیرە[١] دەست بخرێت. تەنانەت تا ڕادەی عەدەمیشی لێ دێت و هەر دەست ناکەوێت.

---

(١) پارە: پارچە دراوێکی نەختینەیە یەکسانە بە چارەکە قورشێك. لیرە: دراوێکی ئـاڵتوونییە لە سەد قورش پێکهاتووە. بڕوانە: "المعجم الاقتصادي الاسلامي". (وەرگێڕ)

ئەو ئاســــانییەی کە لە بەدیهێنــانی زینــدەوەران و کــاری ڕێکوپێکیانــدا دەبینرێت و بە وێنەی ئاسانی و ڕێکوپێکیی کاری کاتژمێرێك یـان مەکینـەیەکی کارەبایی وایە کە تەنها بە دەستدان لە سویچەکەی دەکەوێتە کار، ئەم ئاسانییە لە ڕێی شیرکدا تا پلەی نەهاتنەدی(ئیمتیناع) سەخت و پڕ لە گیروگرفت دەبێت.

ئەو زیندەوەرانەش کە لە ڕۆژێك یان سەعاتێك یـان دەقیقەیەکـدا، هـاودەم لەگەڵ هەموو ئـامێر و کۆئەندام و هەلومەرجەکـانی ژیـانیاندا، دێـنە نـاو ئەم ژیان و دنیایە، لە ڕێی شیرکدا ناتوانن بە ساڵێك بەڵکو بە چەرخێك بێـنە دنیـا و ژیانەوە، تەنانەت هەر ناشیەن!

کۆمەڵە پەیـامی "سراج النـور" لە سـەد شـوێن زیـاتردا بـۆ سەرسـەختترین کەسی ئینکار و ملنەدەریشی چەسپاندووە کە ئەگەر بەدیهێنانی هەمـوو شـتێك بدرێتە پاڵ زاتی خواوەنـدی گەورەی تـاك و تەنیـا ئەوا بەدیهێنـانی هەموویـان بەوپەڕی خێرایی و بە وێـنەی بەدیهێنـانی یەك دانە شـت ئاسـان دەبێـت و، بە هەرزانی و زۆر و زەبەندەیی دێت بەدەستەوە.

بەڵام گەر بەشـێك لەم کـاری بەدیهێنـانە بخـرێتە ئەسـتۆی "سروشـت" و "هۆکارەکان" ئەوا بەدیهێنانی یەك دانە شت گەلێ سەخت و ئـاڵۆز و سسـت و بێ بەها دەبێـت و، بە وێـنەی بەدیهێنـانی هەمـوو شـتان خەرجـی و مەسرەفی زۆری تێدەچێت و گران دەبێت.

ئەگەر حەز دەکەیت بەڵگەکانی ئەم ڕاستییە ببینیت، ئەوا:

بڕوانە مەکتووبی بیستەم و سی و سێیەم و، وتەی بیسـت و دووهەم و سی و دووهەم و، سەرنجیش لە بریسکەی بیست و سـێیەمی تـایبەت بە سروشـت و بریسکەی سییەمی تایبەت بە دەوشانەوەکانی ئیسمی ئەعزەم بـدە، بە تـایبەت سەرنجی چوارەم و شەشەم کە لە دووناوی جوانی "الفَرْد" و "القَيُّوم" دەدوێـن. ئەو کاتە دەبینیت ئەم ڕاستییە لەو پەیامانەدا هێندە بە دڵنیـایی چەسـپێنراون وەك گومان نەکردن لەوەی کە دوو کەڕەت دوو دەکاتە چوار.

بەڵام لێرەدا و بەم شێوەیەی خوارەوە ئاماژە بۆ بەڵگەیەك لە نێوان ئەو سەدان بەڵگانەدا دەکەین:

بەدیهێنانی شتان، یان لە نەبوون(عَدَم)ەوە دەبێت، یان بە دروستکردن واتە پێکهێنان دەبێت بە کۆکردنەوەیان لە توخم و بوونەوەرەکان..

جا ئەگەر کاری بەدیهێنان - لە عەدەمەوە - بدرێتە پاڵ خوای تاك و تەنیا، ئەوا دەبێ زاتی شکۆمەندی خواوەندی بەدیهێنەر زانستێکی دەورەدەر بە هەموو شتێك و توانستێکی زاڵیشی بەسەر هەموو شتێکدا ببێت.

لەبەر ئەوە، بەخشینی بوونی دەرەکی بەو شتانەی کە شێوە و وجوودی عیلمییان لە زانستی خوای گەورەدایە و هێنانیان لە عەدەمێکی ڕواڵەتییەوە بۆ ناو ئەم وجوودە دەرەکییە، بۆ خوای گەورە هێندە ئاسانە کە وەك هێنانی ماددەیەکی کیمیایی وایە بەسەر نووسینێکی نەبینراودا تاکو دەربیخات و، بە وێنەی گواستنەوەی وێنەکان وایە لە کامێراوە بۆ سەر کاغەزی تایبەتیی وێنەکان. جا هەروەك ئەمانە وان، ئەو شتانەش کە بەرنامە و نەخشە و ئەندازە مەعنەوییەکانیان لە زانستی کردگاری مەزندایە، خواوەند تەنها بە فەرمانی "کُنْ فَیَکُون" لە عەدەمێکی ڕواڵەتییەوە دەیانهێنێتەدەر بۆ وجوودێکی دەرەکی.

خۆ ئەگەر بەدیهێنان لە عەدەمەوە نەبێت و بریتی بێت لە دروستکردن و پێکهێنان لە شتی تر، ئەوا کۆکردنەوەی ئەو شتانەش لە توخمەکان و بوونەوەرانەوە بە هەمان جۆر بۆ خوای گەورە کارێکی تابلێی سووك و ئاسانە. چونکە هەروەك کۆکردنەوەی سەربازە بڵاوبووەکانی لەشکرێکی دیاریکراو تەنها بە لێدانی دەنگی شەیپوورێکی سەربازی و ڕیزبوونی هەریەکەیان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك کارێکی تابلێی ئاسانە و، هەموو سەربازەکانیش وەکو هێزێکی پشتگیریان لێ دێت بۆ پێشەواکەیان و یاسا جێبەجێکراوەکەی و چاوی بینەری ئەو لە پێناوی ئاسانکردنی کاری بەرەو سەربازی بردن و پارێزگاریکردنی شێوە و بارودۆخێکی تایبەتی..

جا هەروەك ئەمە بەم شێوەیە ئاسانە، بە هەمان جۆر ئەو گەردیـلانەش کە لە ژێـــر فەرمـــان و ســـەرکردایەتیی پەروەردگـــاری جیهانەکانـــدان، بە یاســـا و دەســتوورەکانی قەدەر و زانست و توانستی زاڵ و بەتوانـای خواوەنـد دەدرێـنە بەر و ئەو بوونەوەرانەش کە کەمترین پەیوەندیشـیان بەو گەردیـلانەوە هەیە بە وێنەی هێز و یاسا و کارمەندەکانی ئەو پادشایە دەبن بە هۆکـاری ئاسـانکردن و ڕایی بوونیان. ئیتر ئەو گەردیـلانە دێـن و بـوونی ئەو زینـدەوەرە پێکـدەهێنن و دەڕۆنە ناوەندی ئەندازەیەکی دیاریکراو کە وەك قاڵبێکی مەعنەوی و زانسـتی و قەدەریی خوای گەورە وایە و، ئیتر لەوێدا ڕادەوەستن و جێگیر دەبن.

بەڵام گەر بەدیهێنانی شتان بە چەند دەستێکی جیاجیا بسـپێررین و بخـرێنە ئەسـتۆی شـتانی وەك "سروشـت" و "هۆکارەکـان"ەوە، ئەوا هـیچ هۆکارێـك ناتوانێت لە هیچ ڕوویەکەوە هیچ شتێك لە عەدەمەوە بەدی بهێنێت! کە ئەمەش دەرەنجامێکە هەموو ژیران لەسـەری یەکیـان گرتـووە. چـونکە ئەو هۆکـارە نە خـاوەنی زانینـێکە کە دەورانـدەوری هەمـوو شـتێکی دابێـت و نە توانسـتێکی وەهـاشی هەیە کە بەســەر هەمــوو شــتێکدا زاڵ بێــت. کەواتە ئەو عەدەمە - ســەبارەت بەو - تەنهـا عەدەمـێکی ڕواڵەتی و دەرەکی نابێـت، بەڵکـو لەگەڵ ئەوەشدا عەدەمێکی ڕەهـا(مطلق) دەبێـت. خـۆ عەدەمـی مـوتڵەقیش هەرگیـز نابێت بە مایەی سەرهەڵدانی هیچ وجوودێك!

کەواتە دەبــێ ئەو شــتە لە لایەن ئەو هۆکــارەوە بە ڕێگــای دووهەم (واتە بە پێکهێنان) بەدی بهێنرێت، کەچی پێکهێنان و بنیاتنـانی جەسـتەی یەك "مـێش" یــان یەك دانە "گــوڵ" - وەك نمــوونەیەك - داخــوازی ئەوەیە کە هەمــوو گەردیلەکانی ئەو شتە و دوای پاڵفتەکردنیان لە چەندین پاڵێوگەی دیـاریکراوی ورددا لە سەرانسەری ڕووی زەوی کۆبکرێنەوە. خۆ دیارە ئەمەش مەگەر دوای چەندین گیروگرفتی زۆر دەنا ئەنجام نادرێت.

ئنجا دوای هێنانی ئەم شتانەش، پارێزگاری کردنیان لە شێوەیەکی ڕێکوپێکدا، بێ ئەوەی لەناو ئەو جەستەیەدا پەرتەوازە ببن، کارێکی تری تابڵێی قورس و دژوارە. چونکە لەم گریمانەدا کە هۆکارەکان بەدیهێنەر بن هیچ قاڵبێکی مەعنەویی زانستی لە ئارادا نابێت و، هێندەی ئەندامەکانی جەستەی ئەو زیندەوەرەش پێویست بە قاڵبی ماددی و سروشتی دەبێت تاکو جەستەی ئەو زیندەوەرە پێك بێت و بنیات بنرێت!

بەم جۆرە دەرکەوت کە گێڕانەوەی بەدیهێنانی هەموو شتێك بۆ خوایەکی تاك و تەنیا تا ڕادەی پلەی پێویستی و "وجووب" ئاسانیی لەڕادەبەدەری لێ دەبێتەوە، بە پێچەوانەی گێڕانەوەی ئەم کارە بۆ هۆکارە زۆر و زەبەندەکان کە تا پلەی "مەحاڵ" گیروگرفتیان لێ دەبێتەوە.

جا ئەگەر ڕاپەڕاندنی کاروباری هەموو شتێك بە هی خوایەکی تاك و تەنیا دابنرێت، ئەوا نرخ و بەهای لەڕادەبەدەر و زۆر و زەبەندەیی ڕەها و ئەوپەڕی وردەکاری و دانایی و بەهێزی بە هەموو بوونەوەرێکی خاوەن وجوودەوە دەبینرێت..

بەڵام گەر لە ڕێگەی شیرکەوە بدرێنە پاڵ سروشت و هۆکارە زۆر و زەبەندەکان، ئەوا ئەو بوونەوەرە لەوپەڕی گرانی و بێنرخی و ناشیرینی و ئاڵۆزی و لاوازیدا دەبێت..

ئەوەتا تەنیا کەسێك بە سیفەتی سەربازی و لە ڕێی پەیوەندیکردنی بە سەرکردەیەکی مەزنەوە هێزێکی مەعنەوی بەدەست دەهێنێت، چونکە گەر پێویست بکات دەتوانرێت سوپایەکی مەزنی بۆ کۆ بکرێتەوە، جگە لەوەش کە هێزی ئەو سەرکردە و سوپایە هێزێکی پاڵپشتی بۆ پێکدەهێنن و هێز و توانا کەسییەکەی خۆی هەزاران جار زیاد دەبێت و توانستێکی ماددی بەدەست دەهێنێت، جگە لەمانەش ناچاری هەڵگرتنی سەرچاوەکانی ئەو هێزانەش نابێت کە پەیوەندیی پێوە کردوون و گەنجینەکانی تەقەمەنییەکانیشی بۆ خۆی

هەڵناگرێت، چونکە سوپا بۆی هەڵدەگرێت و بۆ شوێنی پێویست دەیانگوێزێتەوە. بۆیە ئەو سەربازە دەتوانێت "موشیر"ێکی دوژمن دیل بکات و شارێکی کاملێش لە دانیشتووانی چۆڵ بکات و دانیشتووانی قەڵایەکی گەورەش ملکەچ و گوێڕایەڵ بکات. ئیتر لەم ڕووەوە کە پەیوەندیی بەو هێزە گەورەیەوە کردووە، جێدەست و ئاسەوارەکانی دەراسا و بایەخدار دەبن.

بەڵام گەر ئەو کەسە دەست لە سەربازی هەڵبگرێت و سەربەخۆ کار بکات، ئەوا بە تەواوی ئەو هێز و توانستە مەعنەوی و دەراسایانە لەدەست دەدات و وەکو مرۆڤێکی ئاسایی لێ دێت کە مەگەر هێندەی هێزە کەسییەکەی خۆی و لە شتانی سادە و جوزئی و بێبایەخدا دەنا توانای هیچ شتێکی نییە. ئیتر هەر بەو ڕێژەیەش جێدەست و کاریگەرییەکانی تەسك دەبنەوە.

هەر بە وێنەی ئەم نموونەیە، لە ڕێی "تەوحید"دا هەموو شتێك پەیوەندیی بە خاوەن توانستی شکۆمەندەوە دەکات و پشتی پێ دەبەستێت. لەبەر ئەوە، هەروەك مێروولەیەك بەسەر فیرعەونێکدا و مێشوولەیەك بەسەر نەمروودێکدا و میکرۆبێکیش بەسەر ستەمکارێکی سەرسەختدا زاڵ دەبێت و، هەروەك تۆوێکی بچووکیش درەختێکی گەورەی وەك چیا لەسەر شانی هەڵدەگرێت و دەشبێت بە سەرچاوە و گەنجینەی هەموو ئامراز و ئامێرەکانی ئەو درەختە.

بە هەمان جۆر هەموو گەردیلەیەکیش، بەهۆی ئەم پاڵ پێوەدان و نیسبەت پەیداکردنەوە، دەتوانێت چەندین ئەرکی بێسنوور و لەژمارەبەدەر ئەنجام بدات، وەك پێکهێنانی جەستە و شێوەکان کە سەدان هەزار وردەکاری و جۆر و شکڵ و شێوەیان لەخۆ گرتووە. هەروەها ئەو کاتە سەرجەمی ئەو ئاسەوارانەش کە ئەو فەرمانبەرداره ناسکۆڵانە و ئەم سەربازە بچووکانە ئەنجامیان دەدەن، لەوپەڕی کەماڵ و وردەکاری و بەنرخی و باشیدا دەبن، چونکە ئەو کەسەی کە ئەو ئاسەوارانە دروست دەکات تەنها خواوەندی خاوەن توانستی شکۆمەندە و

ئەو ئاسەوارانەی بە دەستی ئەو کارمەندانە سپاردووە و کردوونی بە پەردەی ڕووی توانستی خۆی.

بەڵام ئەگەر - بە وێنەی ڕێی شیرك - ئەم کارە بدرێتە پاڵ هۆکارەکان، ئەوا کاریگەریی مێروولەیەك هێندەی مێروولەکە خۆی بچووك و بێنرخ دەبێت و وردەکاریی گەردیلەش بە وێنەی خودی گەردیلەکە هێندە نادیار دەبێت کە بە هیچ شتێك حساب ناکرێت. بەو واتایەی کە هەموو شتێك، چ لە واتادا و چ لە ڕووی ماددییەوە، نرخی هێندە دادەبەزێت کە تەنانەت "هەموو دنیا" چڵە پووشێکیش ناهێنێت.

مادەم حەقیقەت ئەمەیە کە باسمان کرد و، مادەم هەموو شتێکیش - وەك لە بەرچاودایە - لەوپەڕی بەنرخی و ناوازەیی و هێز و واتا و ناوەڕۆکی قووڵدایە، ئەوا بێگومان جگە لە ڕێی تەوحید هیچ ڕێگایەکی تر لە ئارادا نییە. خۆ ئەگەر بێت ئەوا دەبێ بوونەوەران ئاڵوگۆڕیان بەسەردا بێت و دنیاش لەناو عەدەمدا ڕۆ بکرێت و سەرلەنوێ لە بریی ئەو بە چەندین شتی بێنرخ پڕ بکرێتەوە، تاکو ڕێگایەك لە بەردەم "شیرك"دا بکرێتەوە بۆ ئەوەی بیگرێتەبەر!

وا بە گوێی خۆت پوختەی یەك دانە بەڵگەت لەو سەدان بەڵگانە بیست کە تایبەتن بە تەوحیدەوە و لە پەیامەکانی نووردا ڕوون کراونەتەوە.

❑ خواستی سێهەمی تەوحید:

بەدیهێنانی هەموو شتێك بە تایبەت "زیندەوەران" لەوپەڕی ناوازەیی و ڕێکوپێکیدایە. زیاد لەمانەش ناوکێکی بچووك نموونەی بەرەکەیەتی و، بەریش نموونەی درەختە و، درەختیش نموونەی جۆر(نوع)ە و، جۆریش نموونەی بچووك و کورتە پێرست و نەخشەی پوخت و تۆوی مەعنەویی گەردوونە، هەروەك خاڵێکی گشتی و داچۆڕاوی ئەم گەردوونەیە و دڵۆپێکە لە هەوێنی ئەم گەردوونە کە بە چەندین دەستووری زانستی و تەرازووی دانست لێی هەڵێنجراوە.

جا هەركەسێك بتوانێت یەكێك لەم شتە ناوبراوانە دروست بكات ئەوا بێگومان هەر تەنها ئەو بەدیهێنەری سەرجەمی گەردوونیشە. بەڵێ، ئاشكرایە كە بەدیهێنەری كاڵەك هەر ئەو كەسەیە كە تۆوە كاڵەكی بەدی هێناوە نەك كەسی تر، بەڵكو مەحاڵە جگە لەو كەسی تر بەدیهێنەری كاڵەك بێت.

بەڵێ، بە چاوی خۆمان دەبینین كە هەموو گەردیلەیەكی خوێن، تا ڕادەیەكی زۆر ڕێكوپێكیی پێوە دیارە و، هێندە ئەركی گەورە و گرنگ ڕادەپەڕێنێت كە هیچ لە نرخ و بایەخی ئەو ئەركانە كەمتر نەبێت كە ئەستێرەكان جێبەجێیان دەكەن و ڕایاندەپەڕێنن..

هەروەها هەموو خڕۆكەیەكی سوور و سپیی خوێن، بە هەست و نەستێكی تەواو ئەركەكانی سەرشانیان بەرامبەر بە لەش ڕادەپەڕێنن، لەو ڕووەوە كە لەش دەبووژێننەوە و پارێزگاری لە ژیانی دەكەن. ئەم كارەش هێندە بە كامڵی ئەنجام دەدەن كە پێش گەورەترین كارمەندی دابەشكردنی ئازووقە و دڵسۆزترین سەربازی پارێزگاریكردن كەوتوونەتەوە!!

هەروەها خانەكانی جەستەش هەریەكەیان دەرامەت و خەرجییە كاركراوەكانی خۆیان هەیە و.. هێندە مامەڵەی ڕێكوپێك و كارامەیی بەردەوامیش لەناو جەستەدا دەست بەكارە كە پێش بەڕێوەبردنی كامڵترین جەستە و ناوازەترین كۆشكیان داوەتەوە..

هەموو تاك و دانەدانەیەكی ڕووەك و زیندەوەرانیش هێندە نیشانەی جوداكەرەوەیان لە ڕوخسار و ئامێرەكانی ناو جەستەیاندا هەڵگرتووە كە مەگەر ئەو كەسەی سەرجەمی زیندەوەران و ڕووەكەكانی بەدی هێناوە دەنا كەس ناتوانێت ئەو نیشانانە دابنێت.

هەموو یەكێك لە جۆرەكانی زیندەوەرانیش بە چەشنێكی ڕێكوپێك بەسەر ڕووی زەویدا بڵاوبوونەتەوە و بە شێوەیەكی گونجاویش لەگەڵ جۆرەكانی تردا تێكەڵ بوون. بە ڕادەیەكی ئەوتۆ كە مەگەر ئەو كەسەی هەموو ئەو جۆرانەی

بەدی هێناوە و بەڕێوەیان دەبات و کاروباریان دەسازێنێت و بە یەك جار سەرپەرشتییان دەکات، دەنا هەرگیز ناگونجێت کەسی تر ئەو جۆرە زیندەوەرە بەدی بهێنێت! چونکە ئەو جۆرە زیندەوەرە ڕەنگاوڕەنگانەی بە وێنەی چەند فەرش و ڕایەخێکی زیندوو بەدی هێناوە کە لە چوار سەد جۆری ڕووەك و زیندەوەرانی سەر ڕووی زەوی چنرابێت.

جا ئەگەر شتانی تریش بە هەریەك لەمانەی کە باسمان کردن لێکبدرێنەوە و بەراورد بکرێن، ئەوا مرۆڤ تێدەگات لەوەی کە سەرانسەری گەردوون، لە ڕووی بەدیهێنانەوە، یەکەیەکی سەربەخۆی وایە کە دابەشکردن هەڵناگرێت و، لە ڕووی پەروەردگارێتی و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیشەوە هەمەکییەکە هەرگیز ناتوانرێت دابەش ببێت!

ئەم خواستی سێهەمە لە زۆر بەشی کۆمەڵە پەیامی "سراج النور"دا باس کراوە، بە تایبەت لە هەڵوێستی یەکەمی وتەی سی و دووهەمدا، چونکە لەوێ زۆر بە جوانی ڕوون کراوەتەوە و، چەسپێنراوە بە ڕادەیەك کە بەڵگەیەکی یەکتایی و تەوحید لە هەموو شتێکەوە دەدرەوشێتەوە بە وێنەی ڕووناکیی خۆر کە هەموو شتێك وەك ئاوێنە دەری دەخات. بۆیە لێرەدا بە پوختی لێی دواین و ئەو ڕوونکردنەوەیەی ئەوێمان پێ سەروزیادە.

* * *

# مەقامی سێهەم

## هەندێ لە نیشانەکانی تەوحید

**ئەم مەقامە بە پوختی سێ نیشانەی هەمەکیی "تەوحید" ڕوون دەکاتەوە**

ئەو بەڵگە و نیشانانەی کە "بوون" و "یەکتایی" خواوەند دەچەسپێنن، هێندە زۆرن کە لە ژمـارە نـایەن. کـۆمەڵە پەیـامی "سراج النـور" هەزاران دانەیـان لەو بەڵگانە باس کردووە، بۆیە لەم مەقامەدا تەنهـا بە پـوختی سـێ دانە لەو بەڵـگە هەمەکییانە دەخەینە ڕوو.

● **نیشانە و بەڵـگەی یەکەم** کە وشـەی **"وَحْدَة"** بەرهەم دەهێنێـت، بـریتییە لەوەی کە:

هەموو شتێك یەکبوون(وەحدەت)ی تێدایە. یەکبوونیش بەڵـگە و ئامـاژەیە لەسەر "یەك" کردگـار. گومـان لەوەشـدا نییە کە ئەگەر جێدەسـت و ئاسـەوار "یەك" بوو ئەوا لە دەسـتی "یەك کردگـار"ەوە دەرچـووە، چـونکە "یەك" هەر لە یەکەوە پەیدا دەبێت و دەردەچێت. جا لەبەر ئەوەی هەموو شتێك "یەکبوون"ی تێدایە ئەوا بەڵـگەیە لەسـەر ئەوەی کە ئەو شـتە ئاسـەوار و سـنعەتی کەسـێکی "تاك" و "تەنیا"یە.

بەڵـــێ، گەردوون وەك خـــونچەی گوڵێـــك وایە کە بە هەزاران پەردەی "یەکبوون" داپۆشراوە. بگرە وەك مـرۆڤێکی یەکجـار گەورە وایە کە بە ژمـارەی ناوە جوانەکان و کـارە هەمەلایەنەکـانی خـوای گەورە پۆشـاکی "یەکبـوون"ی

پۆشی بێت. هەروەها درەختی توویای بەدیهاتووانە کە بە ئەندازەی ژمارەی جۆرەکانی بوونەوەران جۆرەکانی "یەکبوون" لە لقەکانیەوە شۆڕ بوونەتەوە.

بەڵێ، بەڕێوەبردنی گەردوون یەکێکە.. بەڕێکردن و سازاندنی کارەکانی یەکێکە.. پادشایی و دەستەڵاتدارییەکەی یەکێکە.. نیشانەکەی یەکێکە. بەم جۆرە، یەکێکە.. یەکێکە.. یەکێکە، تا دەگاتە هەزار جار "یەکێکە"!

ئنجا ناوە جوانەکان و کارەکانی خواوەندیش، کە ئەم گەردوونە بەڕێوە دەبەن، هەموو یەکێکیان لە شوێنی خۆیدا "یەکێکە". سەرەڕای ئەوەی کە هەموو یەکێکی ئەو کار و ناوانەی خواوەند دەورانەوری سەرانسەری گەردوون یان زۆربەی گەردوونیان داوە. واتە ئەو دانستەی لە گەردووندا کار دەکات یەکێکە.. ئەو چاودێرییەی کە تیایدایە یەکێکە.. ئەو ڕێکخستنەی کە لە گەردووندایە یەکێکە.. ژیاندنی زیندەوەرانی ناوی یەکێکە.. ئەو میهرەبانییەی کە بە هانای موحتاجانی ناو گەردوونەوە دێت یەکێکە.. ئەو بارانەی کە وەك مژدەیەکی میهرەبانییەکەی خواوەند دەبارێت یەکێکە..

بەم جۆرە، یەکێکە.. یەکێکە.. یەکێکە، تا دەگاتە هەزار جار "یەکێکە"!

هەروەها ئەو خۆرەی کە گەرمی لەم گەردوون و گێتییەی خۆماندا پەخش دەکات یەکێکە.. ئەو مانگەش کە ڕووناکی بڵاو دەکاتەوە یەکێکە.. ئەو ئاگرەش کە خواردەمەنییەکان دەکوڵێنێت و پێیاندەگەیەنێت یەکێکە.. ئەو چیا و شاخانەش کە بریتین لە چەند گەنجینە و مێخێکی پڕ لە گەنجینە یەکێکە.. ئەو هەورەش کە باخ و بێستانەکان ئاودێری دەکات یەکێکە..

بەم جۆرە، یەکێکە.. یەکێکە.. یەکێکە، تا دەگاتە هەزار!

جا ئەم یەك یەکانەی ناو جیهان بەڵگەیەکی ڕووناکی چەشنی خۆری درەخشانن لەسەر خواوەندی تاك و تەنیا و، یەك بە یەکیان ئاماژەی بۆ دەکەن.

هاودەم لەگەڵ ئەوەدا کە توخمەکانی ئەم گەردوونە و جۆرەکانی ئەو توخمانەش یەکێکن، لەو ڕووەشەوە کە هەموو لایەکی گۆی زەوییان

گرتووەتەوە و ڕۆشتوونەتە ناو یەکەوە و لە ڕێی چەند پەیوەندییەکی بەهێزەوە بەڵکو بە هاوکاری و یارمەتیدانی یەکتریش لەگەڵ یەکتردا یەکیان گرتووە، لەم ڕووەوە ئەم توخمانە نیشانەیەکی ئاشکرا و بێگومانن لەسەر ئەوەی کە خاوەن و بەدیهێنەری گەردوون یەکێکی تاك و تەنیایە.

● **نیشانە و بەڵگەی دووهەم** کە وشەی **"لا شریكَ لە"** بەرهەم دەهێنێت بریتییە لەوەی کە:

ڕێکوپێکییەکی تەواو کامڵی بێ کەموکووڕی و پێکەوەگونجانێکی یەکجار جوانی بێ ناتەواوی و تەرازوویەکی دادگەرانەی دوور لە ستەم لە هەموو شتێکی ئەم گەردوونەدا هەیە، هەر لە گەردیلەکانەوە تا دەگاتە گەلەستێرەکان.

بەڵێ، ڕێکوپێکیی ناوازە و تەرازووی ورد تەنها بە "یەکبوون" و "یەکتایی" دەبێت. چونکە ئەگەر دەستە جیاجیاکان لە هەر کارێکدا خۆیان هەڵبقورتێنن ئەوا - وەك ئاشکرایە - تێکی دەدەن.

ئێستا وەرە سەرنج لە "سام و شکۆی" ئەم ڕێکوپێکییە ناوازەیە بدە کە ئەم گەردوونەی خستووەتە شێوەی کۆشکێکی مەزنی ئەوتۆ کە هەموو یەکێك لە بەردەکانی سنعەتی تەواوەتیی کۆشکەکەی تێدایە..

هەروەها ئەم گەردوونەی وەك شارێکی ئەوتۆ لێ کردووە کە هێندە بە جوانی ڕێك خراوە و ڕێسای بۆ دانراوە کە ڕۆشتنی خەرجییە بێسنوورەکانی و، هاتنی دەرامەتە لەژمارەبەدەرەکانی و، ماڵ و سامانە بەنرخ و ئازووقە و ڕۆزییە جۆراوجۆرەکانی لە پشت پەردەی غەیبەوە و هەریەکەیان لە کاتی گونجاودا و بێ ئەوەی لە حسابدا بووبێت بە ڕێکوپێکییەکی تەواو بۆ جێبەجێ بکرێت..

هەروەها گەردوونی وەکو کتێبێکی ڕەوانی هێندە ئیعجازبەخش لێ کردووە کە هەموو یەکێك لە پیتەکانی واتا و ناوەرۆکی سەد دێڕ دەگەیەنێت و، هەموو دێڕێکیشی واتا و ناوەرۆکی سەد لاپەڕە دەنووسێت و، هەموو لاپەڕەیەکیشی واتا و ناوەرۆکی سەد فەسڵ و، هەموو فەسڵێکیشی واتا و ناوەرۆکی سەد

کتێب دەردەبڕێت. جگە لەوەی کە هەموو فەسڵ و لاپەڕە و دێڕ و وشە و پیتێکیشی ئاماژە بۆ یەکتری دەکەن و بەڵگەن لەسەر ئەوانی تر!

ئنجا وەرە سەرنج لە "کەماڵی ڕێکخستن"ی ناو ئەم ڕێکوپێکییە سەرسوورهێنەرە بدە کە بە وێنەی شارێکی ڕەنگینی خاوێن سەرانسەری گەردوونی بە پاك و خاوێنی ڕاگرتووە! تەنانەت وەك کۆشك و تەلارێکی ناوازەی ئەوتۆی لێ کردووە کە ئەوپەڕی بایەخ و چاودێریی بە پاکوخاوێنی تێدا بدرێت، بەڵکو وەك حۆرییەکی بەهەشت وایە کە حەفتا دەست بەرگ و پۆشاکی ڕازاوە و جوانی لەبەر کردبێت، بگرە وەك گوڵێکی ناسك وایە کە بە حەفتا پەڕە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ بەرگی تێگیرابێت!

هەروەها وەرە سەرنج لە "کەماڵی دادگەری"ی ئەم تەرازووە بدە لە ناوەندی ئەم ڕێکوپێکی و جوانییەدا. ئەوەتا کەماڵی ئەو دادگەرییە لە ڕادەیەکدایە کە هەموو شتێك بەو تەرازووە هەڵدەسەنگێنرێت، ئەوەتا ئەو زیندەوەر و بەدیهێنراوانەی کە مەگەر دوای گەورەکردنەوەی هەزار جار ئنجا ببینرێن، هاودەم لەگەڵ ئەو ئەستێرە و خۆرانەی کە هەزار جار لە گۆی زەوی گەورەترن، هەموویان بەو پێوەر و تەرازووە، پێوانە و کێشانە دەکرێن و، هەریەکەیان بە تەواوی و بێ هیچ ناتەواوییەك پێداویستییەکانی خۆی دەدرێتێ، بە ڕادەیەك کە ئەو بوونەوەرە یەکجار وردیلانە هاودەم لەگەڵ ئەو بەدیهاتووە گەورە و دەراسایانە لە بەردەم ئەو تەرازووی دادگەرییەدا بە یەکسانی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت! لە کاتێکدا کە ئەو بەدیهاتووانە هی وایان تێدایە کە کاریگەرییەکی هێندە مەزنی هەیە گەر بۆ ماوەی یەك چرکەش هاوسەنگییەکەی ڕەچاو نەکرێت هاوسەنگیی جیهان تێك دەدات و، لەوانەیە ببێت بەهۆی تەقینەوە و بەرپابوونی قیامەت!

هەروەها وەرە سەرنج لەم "جوانییە درەخشانە"ی ناو ئەم ڕێکوپێکی و خاوێنی و تەرازووە بدە کە ئەم گەردوونە گەورەیەی خستووەتە سەر شێوەی

فیستیڤاڵێکی لەوپەڕی جوانیدا و پیشانگایەکی ناوازەش لەوپەڕی ئارایشت و ڕەنگینیدا و بەهارێکی هێندە جوان و خەملاویش کە هەر ئێستا گوڵەکانی دەمیان پشکووتا بێت!

ئنجا ئەم بەهارەشی وەکو گوڵێکی گەورەی هێندە فراوان لێ کردووە کە بە سەدان هەزار گوڵی جوانی خۆی هەموو ڕووی زەویی داپۆشیوە و، هەموو یەکێکی ئەو گوڵانەش لە جوانترین ئارایشت و ناوازەترین جوانیدان، بەڵکو بەهاری وەك گوڵدانێکی جوان و چەپکە گوڵێکی ناسك لە بەردەمیاندا داناوە!

بەڵێ، هەموو "جۆر"ێك لە جۆرەکانی بوونەوەران، تەنانەت هەموو "دانە"یەك لە دانە و تاك تاکەکانی ئەو جۆرانە، بەپێی توانا و لێهاتنی خۆی، بەشێکیان لە جوانیی نەبڕاوەی ناوە جوانەکانی خواوەند پێ بڕاوە، بە ڕادەیەك کە وای لە "حوججەتولئیسلام" ئیمامی غەزالی(١) کردووە کە بڵێت:

"ليس في الإمكان أبدع مما كان"!

واتە لە بازنەی ئیمکاندا شتێك نییە لەم بەدیهێنراوانە ناوازە و جوانتر بن.

جا ئەم جوانییە گشتگیر و سەرنج ڕاکێشە و..

ئەم پاکوخاوێنییە گشتی و دەراسایە و.. ئەم تەرازووە هەستیارە زاڵ و هەمەلایەنەیە و..

ئەم ڕێکوپێکی و پێکەوەگونجانە ئیعجازبەخشەی کە هەموو شتێکیان گرتووەتەوە، بەڵگەیەکی گومانبڕن لەسەر "یەکتایی" و نیشانەیەکی ڕووناکن

---

(١) ئیمامی غەزالی (٤٥٠-٥٠٥ك) ناوی ئەبوو حامید محەممەدی غەزالییە. کەڵەزانای زانستەکانی فیقهی شافیعی و کەلام بووە، بە چاکسازێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی و خاوەن پەیامێکی ڕۆحی دادەنرێت کە جێدەستی هەر لە سەردەمەکەی خۆیەوە هەتا ئێستا نمایانە. لە شاری "تووس" لە دایك بووە و وەفاتی کردووە. ئەمە ناوی هەندێکە لە بەرهەمەکانی: "إحياء علوم الدين"، "تهافت الفلاسفة"، "المنقذ من الضلال"، "الأربعين في أصول الدين". بڕوانە بەرگی یەکەمی کتێبی (رجال الفكر والدعوة في الإسلام)ی (سەیید ئەبولحەسەنی نەدوی) و، (هكذا ظهر جيل صلاح الدين)ی (د. ماجد الكيلاني). (وەرگێڕ)

لەسەر "تەوحید" کە زۆر درەخشانترن لە ڕۆشنایی خۆر لە ناوەڕاستی ڕۆژی ڕووناکدا.

**وەڵامێکی یەکجار بەهێز و پوخت بۆ پرسیارێکی دوو لقی، کە لەوپەڕی گرنگیدایە و، تایبەتە بەم مەقامەوە.**

❖ **لقی یەکەمی پرسیارەکە:**

تۆ لەم مەقامەدا دەڵێیت: "جوانی" و "دادگەری" دەوراندەوری گەردوونیان داوە. بەڵام ئایا چی دەڵێیت سەبارەت بەم ناشیرینی و گیروگرفت و نەخۆشی و مردنانەی کە بە چاوی خۆمان دەیانبینین؟!

**وەڵام:**

ئەگەر "ناشیرینی"یەك ببێت بەهۆی بەرهەمهێنانی چەند جۆرێکی "جوانی" یان ببێت بەهۆی دەرخستنیان، ئەوا ئەویش بە "جوان" دادەنرێت. هەروەها نەبوونی ناشیرینییەك کە ببێت بەهۆی شاردنەوەی گەلێ جوانی و بوارنەدان بە دەرکەوتنی ئەو جوانییە، ئەوا نەك تەنها بە یەك ناشیرینی بەڵکو بە چەند ناشیرینییەکی دووپاتبووی زۆر و زەبەندە دادەنرێت.

بۆ نموونە:

گەر "ناشیرینییەك" وەك "یەکەیەکی پێوانەیی" پەیدا نەبێت، ئەوا حەقیقەتی "جوانی" دەبێت بە یەك دانە جۆر و پلە زۆر و زەبەندەکانی پەنهان دەبن و بەرچاو ناکەون. بەڵام بە تێکەڵبوونی ناشیرینیی لەناو ئەو جوانییەدا پلەکانی جوانییەکە دەردەکەون. چونکە هەروەك پلەکانی "گەرما" بە تێکەڵبوونی سەرما و پلەکانی "ڕووناکی" بە بوونی تاریکی دەردەکەون، بە هەمان جۆر بەهۆی بوونی شەڕ و زیان و موسیبەت و ناشیرینیی جوزئییش خێر و بێر و نیعمەتە گشتییەکان و هەموو جۆرە هەمەکییەکانی جوانی دەردەکەون.

واتە بەدیهێنانی "ناشیرینی" کارێکی ناشیرین نییە، بەڵکو جوانە. چونکە زۆربەی ئەو ئەنجامانەی کە لەو ناشیرینییەوە پەیدا دەبن: جوانن!

بەڵێ، ئەو تەمبەڵەی کە زیانی لە بارانەوە پێگەیشتووە هەرگیز ئەم زیانەی نابێت بە بیانوو لە دژی ئەو ئامانجە خێر و باشانەی کە بارانیان کردووە بە سۆز و میهرەبانی و، هەرگیز ئەو بەزەیی و میهرەبانییە ناگۆڕێت بە سزا و تۆڵە.

سەبارەت بە نەمان و مردنیش، ئەوا - هەروەك بە چەندین بەڵگەی بەهێز و بێگومان لە مەکتووبی بیست و چوارەمدا چەسپاندوومانە - هەرگیز دژ و پێچەوانەی میهرەبانیی گشتی و جوانیی هەمەلایەنگر و خێر و چاکەی گشتی نین، بەڵکو لە داخوازییەکانی ئەمانەن، تەنانەت خودی شەیتانیش لەبەر ئەوەی دەبێت بەهۆی بزواندنی ئەو دوو زەمبەلەکەی کە بناغەی پێشکەوتنی مەعنەویی مرۆڤن و بریتین لە "پێشبڕکێ" و "موجاهەدە" ئەوا بەدیهێنانی جۆری شەیتان خێری تێدایە و لەم ڕووەوە بە شتێکی جوان دادەنرێت. تەنانەت ئازاردانی کافرانیش لە دۆزەخدا کارێکی جوانە، چونکە بەهۆی کوفرەکەیەوە دەستدرێژیی کردووەتە سەر مافی سەرانسەری بوونەوەران و گاڵتە و سووکایەتیی بە پلە و پایە بەرزەکانیان کردووە و لە ڕێزی ئەوانی کەم کردووەتەوە. جا لەبەر ئەوەی ئەم دوو خاڵە بە درێژی لە پەیامەکانی نووردا باس کراون، لێرەدا بەم دوو ئاماژە کورتە واز دەهێنین.

❖ **لقی دووهەمی پرسیارەکە[1]:**

با وا دابنێین کە ئەم وەڵامە گشتییەمان سەلماند کە تایبەتە بە شەیتان و کافرانەوە. بەڵام بۆچی خوای گەورەی دەوڵەمەند و بێ ئیحتیاج و خاوەن جوانیی ڕەها و میهرەبانیی ڕەها و خێری ڕەها چەند دانە و تاك تاکێکی لاواز دووچاری موسیبەت و شەڕ و شتە ناشیرینەکان دەکات؟

---

(١) وەڵامی ئەم لقی دووهەمە گەلێ گرنگە، چونکە زۆر شوبهە و گومان ناهێڵێت. (دانەر)

**وەڵام:**

هەموو جۆرەکانی چاکە و جوانی و نیعمەتەکان، هەر هەموویان ڕاستەوخۆ لە گەنجینەی میهرەبانیی ئەو خاوەن جوانی و میهرەبانییە ڕەهایەوە هاتوون و لە ڕێژنەی چاکەکاریی تایبەتیی خۆیەوە سەرچاوەیان گرتووە. بەڵام گیروگرفت و موسیبەت و شەڕ و ئاکامە خراپەکان بریتین لە چەند ئەنجامێکی جوزئی و کەم و تاك تاك لە ناوەندی گەلێ ئەنجامی تردا کە لە یاسا گشتی و هەمەکییەکانەوە پەیدا دەبن کە یاساکانی دەستەڵاتی پەروەردگارێتیی خواوەندن و ویستە گشتیەکانی خواوەند دەنوێنن لە ژێر ناوی "یاسا و عادەتەکانی خواوەند"دا. ئیتر ئەو کاروبارانە چەند خواستێکی جوزئی دەبن بۆ جێبەجێ بوونی ئەو یاسایانە..

جا لەبەر پارێزگاری و چاودێریکردنی ئەو یاسایانەی کە مایە و خولگەی بەرژەوەندییە هەمەکییەکانن، خوای گەورە ئەو ئەنجامە جوزئییە شەڕاوی و ناشیرینانە بەدی دەهێنێت.

بەڵام لە بەرامبەر ئەو ئەنجامە جوزئییە ئازاربەخشانەوە هەموو ئەو کەسانەی کە پێیەوە گیرۆدە بوون هاوار و هانا بۆ لای خواوەند دەبەن و، ئەویش بە فریاگوزاریی میهرەبانییانەی تایبەتیی خۆی فریایان دەکەوێت و چاکەی تایبەتیی پەروەردگارێتیی خۆی بە هانایانەوە دەنێرێت. بەمەش دەردەکەوێت کە هەر تەنها خوای گەورە بکەر و خاوەن ئیختیارە و، هەموو کاروباری هەموو شتێك پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە ویستی خواوەندەوە هەیە و، یاسا گشتییەکانیشی هەمیشە شوێنکەوتەی ویست و ئیختیاری خواوەندن و، دەریدەخەن کە پەروەردگارێکی میهرەبان هەیە گوێی لە بانگ و هاواری گیرۆدەبووانی تەنگانەی ئەو یاسا گشتییانەیە و فریایان دەکەوێت و بە چاکەی خۆی بە هانایانەوە دەڕوات.

هەر بەو چاکەکاریيە تايبەتی و خۆخۆشەويستکردنە تايبەتيانە دەرگاکانی درەوشانەوە تايبەتييەکانی خۆی خستووەتە سەرپشت، چونکە مەيدانێکی بێسنووری درەوشانەوە نەبڕاوەکانی ناوە جوانەکانی خۆی بە چەند لايەنێکی شازی ياسا هەمەکی و گشتييەکانی خۆی و ئەنجامە جوزئييە شەڕئامێزەکانی ئەو ياسايانە، کردووەتەوە.

جا لەبەر ئەوەی ئەم نيشانە دووهەمەی تەوحيد لە سەد شوێنی "سراج النور"دا ڕوون کراوەتەوە ئەوا لێرەدا بەم ئاماژە ڕێبوارانەيە وازمان هێنا.

● **نيشانە و بەڵگەی سێهەم کە "له الملكُ و له الحمدُ"** بە چەند نيشانەيەکی لە ژمارە بەدەری تەوحيد ئاماژەی بۆ دەکات:

بەڵێ، هەموو شتێکی "کوللی" يان "جوزئی" هەر لە گەرديلەکانەوە تا دەگاتە هەسارە گەڕۆکەکان نيشانەيەکی ئاشکرای تەوحيد بەسەر ڕوخسارييانەوە نەخشاوە، کە ئەمەش هێندە ڕوونە بە وێنەی دەرکەوتنی خۆر لەناو ئاوێنەدا ئاشکرايە و، هەروەك دەرکەوتنی خۆر لەو ئاوێنەيەدا بەڵگەيە لەسەر خۆر، ئاوێنەی ئەو نيشانەيەش کە لەسەر هەموو شتێك نەخشاوە بە هەمان جۆر بەڵگەيە لەسەر ڕووناکیبەخشی ئەزەل و ئەبەد و لەسەر يەکتاييەکەی.

جا لەبەر ئەوەی زۆربەی نيشانە لەژمارەبەدەرەکان لە کۆمەڵە پەيامی "سراج النور"دا بە درێژی ڕوون کراونەتەوە ئەوا لێرەدا تەنها ئاماژە بۆ سيانيان دەکەين:

* نيشانەيەکی فراوانی تەوحيد بەسەر ڕووی "گەردوون"ەوە دەبينين کە لە هاوکاری و پشتگيری و لەيەکچوون و تێهەڵکێشبوونی جۆرەکانی بەديهاتووانی ناو گەردوون پێکهاتووە کە هەريەکەيان لە بەرامبەر يەکترەوە ئەو نيشانەيە دەردەخەن..

* بەسەر ڕووی "زەوی"شەوە نيشانەيەکی ڕوونی تەوحيد دەبينرێت کە دراوە لە سوپايەکی پەروەردگاريی پێکهاتوو لە چوار سەد هەزار ڕەگەز و جۆری ڕووەك و زيندەوەران، لەوەدا کە بێ لەبيرچوونەوەی هيچ کاميان و بە

بێ هیچ هەڵەیەك و لەوپەڕی ڕێکوپێکی و لە کاتی گونجاودا ئازووقە و ڕۆزیی جیاجیا و چەك و پێداویستیی جۆراوجۆر و بەرگ و پۆشاکی ڕەنگاوڕەنگ و تەعلیماتی جیاواز و ئیزن و ڕوخسەتی جیاجیایان پێ دەبەخشرێت.

* نیشانەیەکی یەکتاییش بەسەر ڕووی "مرۆڤ"ەوە دەبینرێت کە ئەو نیشانە جوداکەرەوانە دەریدەخەن لە ڕووی هەموو مرۆڤێك دراون، بە ڕادەیەك کە هەموو یەکێکی ئەو ڕووانە لە هەموو ڕوخسار و ڕوویەکی تری سەرتاسەری زەویی جیا دەکەنەوە.

تەنانەت بەسەر ڕووی هەموو بەدیهاتوویەکی جوزئی یان کوللییەوە نیشانەیەکی "تەوحید" دەبینرێت و.. بەسەر هەموو بەدیهێنراوێکی گەورە یان بچووك کەم یان زۆرەوە مۆری "تەنیایی" بەرچاو دەکەوێت، بە تایبەت ئەو نیشانانەی کە لە زیندەوەران دراون و چەند نیشانەیەکی تەوحید و مۆرێکی یەکتایی و مۆرکێکی تەنیایی و تەمغەیەکی صەمەدییەتی خوای گەورەیە.

بەڵێ، هەموو گوڵ و بەر و گەڵا و ڕووەك و زیندەوەرێك مۆرێکی تەنیایی و تەمغەیەکی صەمەدییەتە، بە چەشنێك کە هەموو درەختێك دەخاتە شێوەی نامەیەکی پەروەردگاری و، هەموو ڕەگەز و جۆرێکی بوونەوەرانیش بە وێنەی کتێبێکی پەروەردگاری دەردەخات و، هەموو باخچەیەکیش لە شێوەی مەرسوومێکی پادشایی خواوەندا پیشان دەدات. تەنانەت بە ئەندازەی ژمارەی گوڵ و بەر و گەڵای ئەو نامەی درەختە مۆر و تەمغە و ئیمزا لەو نامەیە (لەو درەختە) دراوە..

ئنجا بە ئەندازەی ژمارەی دانە دانە و تاك تاکەکانی کتێبی ئەو جۆر و ڕەگەزە، مۆر لەو کتێبە دراوە بۆ مەبەستی دەرخستن و ناساندنی نووسەرەکەی.. هەروەك ئەو مەرسوومە پادشاییەی باخچەکەش بە ئەندازەی ژمارەی ڕووەك و درەخت و زیندەوەرانی ناوی نیشانەی یەکتایی تێدا دانراوە تاکو پادشای فەرمانڕەوا و خاوەنی ئەو باخچەیە بە بینەرانی بناسێنێت.

تەنانەت سەرەتا و کۆتایی و ڕواڵەت و ناوەوەی درەختیش چوار نیشانەی تەوحیدیان تێدایە کە بەم ناوە جوانانە ئاماژەیان بۆ کراوە:

﴿هُوَ الأَوَّلُ والآخِرُ والظَّاهِرُ والباطِنُ﴾.

ئەو شتەی کە بە ناوی جوانی **"الأول"** ئاماژەی بۆ دەکرێت، بریتییە لەوەی کە: ئەو تۆوەی[1] کە سەرەتای بنەڕەتیی هەموو درەختێکی بەردارە، قوتوویەکی بچکۆلەیە و بەرنامە و پێڕست و پلانی کاری ئەو درەختەی لەخۆدا هەڵگرتووە. هەروەك کارگەیەکی بچووکە و ئامێر و پێداویستی و پێکهێنەرەکانی ئەو درەختەی تێدایە. هەروەها مەکینەیەکە گشت ڕێکخستن و دەرامەتە وردەکان و خەرجییە ناسکەکانی ئەو درەختەی هەر لە سەرەتای ژیانیەوە تێدایە.

ئەو شتەش کە بە ناوی جوانی **"الآخر"** ئاماژەی بۆ دەکرێت، بریتییە لەوەی کە: بەر و ئاکامی هەموو درەختێك لیستێکی ناساندنی درەختەکە دەنوێنێت بە چەشنێك کە هەموو شکڵ و شێوە و وەسف و حاڵی درەختەکەی تێدایە.. هەروەك ئەرك و سوود و تایبەتکارییەکانی ئەو درەختە ڕادەگەیەنێت.. هەروەها پوختەیەکە هاوچەشن و وەچە و بەرە داهاتووەکانی ئەو درەختە دەردەخات لە ڕێی ئەو تۆوانەوە کە لە بەری ئەو درەختەدان.

ئەو شتەش کە بە ناوی جوانی **"الظاهر"** ئاماژەی بۆ دەکرێت، بریتییە لەوەی کە: ئەو شکڵ و شێوەیەی کە هەموو درەختێك لەبەری دەکات و پێوەی

---

(١) ئەو وتەیەی کە لە مێژە لەسەر زمانی خەڵکییە و وەك پەندی لێ هاتووە و دەڵێن: "درەخت لە تۆوەوە گەشە دەکات" دەکرێت بە ئاماژەیەکی ئاییندەیی بۆ دانەری ئەم پەیامەش بەکار بهێنرێت، چونکە خزمەتگوزاری پەیامەکانی نوور بە ڕێژنەی بەرەکەتی قورئانی پیرۆز لە هەموو گوڵ و تۆوێکدا دوو میعراجی بۆ ناسینی تەوحید دەرخستووە و سەرچاوەی ئاوی ژیانی لەو شوێنەدا تەقاندووەتەوە کە سروشتییەکان تیایدا پەکیان کەوت و تیاچوون. ئەوەبوو لە "تۆو"ەوە گەیشتە حەقیقەت و نووری ناسینی خواوەند. جا لەسەر بناغەی ئەم حیکمەتە، زۆرجار لە پەیامەکانی نووردا هەردوو وشەی "گوڵ" و "تۆو" دووپات دەبنەوە. (دانەر)

دەردەکەوێت: پۆشاکێکی جوانی ڕەنگینە کە بە باڵای لق و پەل و بەشەکانی ئەو درەختە بڕاوە و بەپێی ئەو بەژن و باڵایەی دووڕراوە و پۆشاکێکی ورد و پڕ لە واتای قووڵە کە بە پێوەر و تەرازووی خۆی کراوەتە بەر ئەو قەد و باڵایە، بە چەشنێك کە ئەو درەختە دەخاتە شێوەی کتێب و نامە و پارچە هۆنراوەیەکی ڕەنگین.

ئەو شتەش کە بە ناوی جوانی "**الباطن**" ئاماژەی بۆ دەکرێت بریتییە لەوەی کە: ئامێرە کارگوزارەکانی ناو هەموو درەختێك لە ڕاستیدا بریتین لە کارگەیەکی هێندە مەزن کە بە تەرازوویەکی هەستیار بەڕێوەبردنی هەموو بەش و ئەندام و پێکهاتن و کاروبارێکی ئەو درەختە پێوانە دەکات و، لە هەمان کاتیشدا کەرەسە و ڕۆزییە پێویستەکانیش بە هەموو ئەندامە جیاجیاکانی ئەو درەختە دەبەخشێت لە ڕێی دابەشکردنێکەوە کە بە ڕێکوپێکییەکی تەواو ورد و لەوپەڕی خێرایی وەك خێرایی بروسکە و، بەوپەڕی ئاسانیی وەك ئاسانیی دانانی سەعات و، بەوپەڕی یەکبوون و یەکێتی ئەوتۆ کە ژیری تێدا سەرسام دەبێت و، بە چەشنی گوێڕایەڵیی سوپا بۆ فەرماندەکەیان ئەنجام دەدرێت.

**بە پوختی:**

سەرەتا و هەوەڵی هەموو درەختێك بریتییە لە بەرنامەیەك و قوتوویەکی بچووك.. کۆتاییەکەشی: نموونە و لیستێکی پێناساندنە.. ڕواڵەتی دەرەوەشی پۆشاکێکی ڕازاوەی ڕەنگینە.. ناوەوەشی بریتییە لە کارگەیەك. جا ئەم چوار لایەنە یەکتر ڕەچاو دەکەن و لە هەر چواریانەوە نیشانەیەکی یەکجار گەورە، بگرە ناوێکی یەکجار مەزن پەیدا دەبێت بە ڕادەیەك کە جگە لەو خواوەندە تاك و تەنیایەی کە جڵەوی هەموو گەردوونی بە دەستە کەسی تر ناتوانێت ئەو کارانە ئەنجام بدات.

جا هەروەك درەخت ئەم نیشانەی تەوحیدەی لەخۆدا هەڵگرتووە، سەرەتا و کۆتایی و ڕواڵەت و ناوەوەی هەموو زیندەوەرێکی تریش بە هەمان جۆر

نیشانەیەکی تەوحید و مۆرێکی یەکتایی و ئیمزایەکی تەنیایی و تەمغەیەکی تاکیی خواوەندی پێوەیە.

هەر بە وێنەی ئەم درەختەی کە لەم سێ نموونەیەدا باس کرا: بەهاریش درەختێکە و گەڵێ گوڵی زۆری گرتووە.. ئەو بنج و ڕەگ و تۆوانەش کە بە ئەمانەت بەدەستی وەرزی پایز سپێرران نیشانەی ناوی "**الأول**"یان هەڵگرتووە..

ئنجا بەروبووم و دانەوێڵە و سەوزییەکانیش کە دەخرێنە باوەشی وەرزی هاوین و کۆشی ئەوی لێ پڕ دەکرێن مۆری ناوی "**الآخر**"یان لەسەر نەخشاوە..

ئەو پۆشاکە سروشتییانەش کە بە سەدان هەزار جوانی نەخشێنراون و وەرزی بەهار لەبەریان دەکات و وەك پۆشاکە سوندسییەکانی حۆریی بەهەشت وان مۆری ناوی "**الظاهر**"یان لەخۆدا هەڵگرتووە و..

ئەو کارگە صەمەدانییانەش کە لە ناوەوەی زەوی و وەرزی بەهاردا کار دەکەن و ئەو مەنجەڵە ڕەحمانییانەش کە دەکوڵێن و ئەو کوڵێنگە(مطابخ) پەروەردگارییانەش کە خواردەمەنییەکانی ئامادە دەکەن تەمغەی ناوی "**الباطن**"یان لەخۆدا هەڵگرتووە. تەنانەت هەموو یەکێك لە جۆرەکانی زیندەوەران، بۆ نموونە جۆری ڕەگەزی مرۆڤیش درەختێکی ترە و، تۆو و ڕەگەکانی بە قووڵایی ڕابوردوودا بڵاو بوونەتەوە و بەروبووم و ئەنجامەکانیشی لە ئایندەدان.

جا هەروەك ئەو یاسا ڕێکوپێك و دەست بە کارانەی لە ناوەندی ژیانی ڕەگەز و مانەوەی هاوجۆرەکانیدا نیشانەیەکی ڕوونی تەوحیدیان لەخۆ گرتووە، بە هەمان جۆر دەستوورە ڕێکوپێکەکانی ژیانی کەسی و کۆمەڵایەتیی باری ئێستای مۆرێکی یەکتایی بەردەوامی لە ژێر ئاڵوگۆڕە ڕواڵەتییەکاندا هەڵگرتووە. هەروەك دەستوورەکانی قەزا و قەدەری ژیانی، کە بریتین لەو موقەددەراتانەی ژیان کە لە ژێر حاڵەتە ڕواڵەتییەکانی مرۆڤەوە شارراونەتەوە، مۆرێکی پەنهان و ڕێکوپێکی تەوحیدیان لەخۆدا هەڵگرتووە.

# كۆتایی

ئاماژەیەكی یەكجار كورت بە گوفتارێك بۆ هەر یەك
لەو پایانەی ئیمان كە نهێنیی تەوحید لەخۆی گرتوون.

ئەی مرۆڤی بێئاگا!

گەر تەنها بۆ یەك جاریش بووە سەرنج بدە و چاو بە ڕوونكردنەوەكانی هەرسێ مەقامەكەی ئەم پەیامەدا بگێڕە، لە هەرسێ بەروبوومو، هەرسێ خواست و، هەرسێ بەڵگەكان.. ئنجا بڕوانە:

ئایا دەگونجێ كردگاری بەتوانای دانا و میهرەبان و زانا بایەخ بە جوانییەكانی حەقیقەتی محەممەدی نەدات كە لە ناوەرۆكدا بەسەر گەردووندا زاڵە؟ یان گرنگی بە تەسبیحاتی ئەحمەدی ﷺ و نوورەكانی ئیسلام نەدات، لە كاتێكدا كە هەر تەنها ئەو كردگارە بەتوانایە كاروباری ئەم گەردوونە بەڕێوە دەبات و ئاساییترین شیفا و چارەسەر و كەمترین شوكرانەبژێری و بچووكترین سنعەتی وەك باڵەمێش پشتگوێ ناخات و، كاروباری ئەم شتە جوزئییانە هەرگیز بە غەیری خۆی ناسپێرێت. كردگارێكە گەورەترین كارمەندی و دانستە مەزنەكانی وەك هی درەخت بە بچووكترین تۆودا هەڵدەواسێت و، لە هەموو سنعەتێكیدا بەخشندەیی و میهرەبانی و دانایی خۆی دەخاتە هەست و نەستی خاوەن هەستانەوە و، بە هەموو هۆكارێك خۆی دەناسێنێت و لە ڕێی هەموو نیعمەتێكیشەوە خۆی خۆشەویست دەكات؟

یان ئایا دەگونجێت مەزنترین ئامانجی ئەو كردگارە شكۆمەندە و گەورەترین ڕووناكییەكانی و فراوانترین ئاوێنەكانی ئەو، ڕیسالەتی ئەحمەدی

ﷺ نەبێـت کە هەمـوو بەدیهـاتووانی ئەوی ڕازانـدووەتەوە و دڵـی هەمـوو بەدیهاتووانی خۆش کردووە و سەرانسەری بوونەوەرانی ڕووناك کـردووەتەوە و ئاسمانەکان و زەویی کردووە بە کۆڕی جەزبەی زیکر و تەهلیل و نیوەی گـۆی زەوی و پێنج‌یەکی گرۆی مرۆڤی بە درێژایی چوارده سەدەی ڕەبەق خستووەتە ژێر باڵی پادشایەتی و فەرمانڕەوایەتیی ماددی و مەعنەویی خۆیەوە؟

یان ئایا دەگونجێ ئەو پێغەمبەرانەش - درووديان لەسەر بێت - کە خـزمەتی هەمان ڕاسـتییان کـردووە وەك حەزرەتی محەممـەد ﷺ نێـرراوی کردگـاری مەزن و خۆشەویست و ڕەوانەکراوی بەڕێـزی ئەو نەبـن؟ نەخێـر بە ئەنـدازەی ژمارەی موعجیزاتی پێغەمبەران نەخێر.

یان ئایا لە هیچ ڕوویەکەوە دەگونجێت کە بەدیهێنەری دانـا و میهرەبـان ئەو حەشرە نەهێنێتە کایەوە کە زۆر لە هێنـانی بەهـار بەلایەوە ئاسـانترە و دەرگـای خانەیەکی بەختەوەری و مەنزڵێکی مانەوە بۆ بەندەکانی نەکاتەوە لە کاتێکـدا کە ئەو بەدیهێنەرە دانا و میهرەبـانە سـەد دانـایی و بەروبـوومی بە یەخەی هەمـوو شتێکی تەنانەت جوزئییشدا هەڵواسیوە و، پەروەردگارێتییە زاتییەکەی خـۆی لە ڕێی حیکمەتە دەراساکانی و گشتگیریی میهرەبانییەکەیەوە بە خـاوەن هەسـتان ناساندووە و لای بەدیهاتووانیشی خۆشەویستی کردووە..

ئایا دەگونجێ ئەم بەدیهێنەرە دانا و میهرەبانە حەشر نەهێنێـتە کـایەوە و بەم نەهێنانەش ئینکاریی: دانایی و میهرەبانی و تەنانەت پەروەردگارێتی و کەمـاڵی خـۆی بکـات و کەسـانی تـریش بـۆ ئینکـاری کردنیـان هـان بـدات و خۆشەویسترین بەدیهاتووانی خۆی بە ئیعدامی هەمیشەیی لەناو ببات؟

نەخێر سەد هەزار هەزار جار نەخێر. چونکە جوانیی ڕەها سەد هەزار جـار بەرز و خاوێنترە لەوەی کە ئەم ناشیرینییە ڕەهایەی لێ بووەشێتەوە.

## پەراوێزێکی دووردرێژ

**پرسیارێك بە بۆنەی باسی حەشرەوە:**

ئەو باسەی کە چەندین جار لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، وەك: **﴿إِنْ كانتْ إلاّ صيحةًواحدةً﴾** (يس:٢٩)، **﴿وما أمرُ السَّاعةِ إلاّ كلمحِ البصر﴾** (النحل:٧٧) ئەوەمان بۆ دەردەخات کە حەشری مەزن ئەوەندە بە کتوپڕی پەیدا دەبێت کە "کات" لە کایەدا نامێنێت. بەڵام زۆرییە تەسکەکان داوای چەند نموونەیەکی هاووێنە و بینراو دەکەن، تاکو بە دڵنیایی مل بۆ ئەو ڕووداوە نائاسایی و بێ وێنەیە کەچ بکەن.

**وەڵام:**

"حەشر" سێ مەسەلەی تێدایە کە ئەمانەن:

گەڕانەوەی گیانەکان بۆ ناو جەستەکانیان.. زیندوو کردنەوەی جەستەکان.. دروست کردنەوە و بنیاتنانەوەی سەرلەنوێی ئەو جەستانە.

**مەسەلەی یەکەم:** هاتن و گەڕانەوەی گیانەکان بۆ ناو جەستەکان.

نموونەی ئەمە، وەك: کۆ کردنەوەی ئەو سەربازانەی کە لە ماوەی پشوودانیاندا بە هەموو لایەکدا بڵاو بوونەتەوە تەنها بە دەنگی لێدانی "شەیپووری سەربازی".

بەڵێ، هەروەك "صور" کە شەیپووری حەزرەتی ئیسرافیلە - دروودی لەسەر بێت - هیچی لە شەیپووری سەربازی کەمتر نییە.. گوێڕایەڵیی گیانەکانیش کە وان لە لای ئەبەدەوە و لە جیهانی گەردیلەکاندان و، کاتێ کە بانگی **﴿أَلَسْتُ بربكم﴾**یان لە قووڵایی ناخی ئەزەلەوە بیست، بە: **﴿قالوا بَلى﴾** (الأعراف:١٧٢) وەڵامیان دایەوە.. بێ هیچ گومانێك، گوێڕایەڵی و ڕێسای ئەم گیانانە گەلێ زیاترە لەچاو گوێڕایەڵی و ڕێسای سەربازەکانی هەر سوپایەکی ڕێکوپێك.

"وتەی سیھەم" بە چەندین بەڵگەی بەهێزی گومانبڕ چەسپاندی کە نەك تەنها "گیانەکان" سوپایەکی ڕێکی خوای گەورەن، بەڵکو هەموو گەردیلەکانیش سەربازی گوێڕایەڵی ئەو سوپایەی ئەون و، ئامادە و چاوەڕوانی فەرمانن بۆ هەر هێرشێکی گشتی کە پێیان بسپێررێت ئەنجامی بدەن.

**مەسەلەی دووهەم:** زیندووکردنەوەی جەستەکان.

نموونەی ئەمە وەك ئەوەی کە دەکرێت لە شەوی میهرەجانی شارێکی مەزندا، تەنها لە یەك مەڵبەندەوە و بە یەك چاوترووکاندن، وەك بڵێی کات هەر لە گۆڕێدا نەبێت، سەدان هەزار گڵۆپی کارەبایی دابگرسێنرێن.. هەروەك ئەمە دەکرێت، دەشتوانرێت - بە هەمان جۆر - لە تەنها یەك مەڵبەندەوە، سەدان ملێون چرای زیندەوەران دابگرسێنرێن و زیندوو بکرێنەوە. چونکە مادەم کارەبا، کە یەکێکە لە بەدیهێنراوانی خوای گەورە و خزمەتکارێکی ڕووناکیبەخشە لەم میوانخانەیەی ئەودا، دارای تایبەتکاریی ئاوا بێت و بتوانێت بەپێی ئەو نەخشە و ڕێسایەی لە لایەن بەدیهێنەریەوە بۆی دیاری کراوە، کارەکانی ڕاپەڕێنێت، ئەوا دەبێ حەشری مەزن، لە نێوان ئەو یاسا خواییانەدا کە هەزاران خزمەتگوزاری ڕووناکی بەخشی وەکوو کارەبا دەریاندەخەن و ئاشکرایان دەکەن، لە خێراییەکی چەشنی چاوترووکاندندا ڕوو بدات.

**مەسەلەی سێھەم:** بنیاتنانەوەی کتوپڕیی جەستەکان.

نموونەی ئەمە وەك:

دروستکردن و بنیاتنانی گشت درەخت و گەڵاکان کە ژمارەیان هەزار جار لە ژمارەی کۆی ئادەمیزاد زیاترە، بنیاتنانی هەموو ئەمانە بە یەك جار و بە شێوەیەکی تەواو و بە هەمان شێوەی بەهاری پێشوو تەنها لە ماوەی چەند ڕۆژێکی بەهاردا.. هەروەها وەك بەدیهێنانی هەموو گوڵ و بەر و گەڵاکانی گشت درەختێك بەوپەڕی خێرایی، بە چەشنی بەهاری پێشوو.. هەروەها وەك

بێـــداربوونەوە و دەرکەوتـــن و زینـــدووبوونەوەی هەمـــوو تـــۆو و نـــاوکە لەژمارەبەدەرەکـان لە یەك کاتـدا، کە هەر ئەمەیشـە بەهـاری لـێ پێکـدێت.. هەروەها وەك زیندووبوونەوەی جەستە مەزن و کەتە و لەسەر پـێ ڕاوەسـتاوی درەختەکان و گوێڕایەڵیی کتوپڕی و خێرایان بۆ فەرمانی "البعث بعد الموت".. هەروەهـا وەك زینـدووکردنەوەی یەك بە یەکی تاکەکـانی هەمـوو جۆرەکـانی زیندەوەرە وردە لەژمارەبەدەرەکان بەوپەڕی وردەکاری و ڕێکوپێکی.. هەروەهـا وەك زیندووکردنەوەی گشـت جۆرەکـانی "مێـروو" بە تـایبەت مـێش (کە وا لە بەرچاومانـدا و، هەمیشـە بە پـاککردنەوەی دەسـت و چـاو و باڵەکـانی دەستنوێژمان دەخاتەوە یاد و یاری لەگەڵ دەم و چاوانماندا دەکـات) کە تەنهـا ژمارەی ئەوانەیان کە لە یەك ساڵدا زیندوو دەکـرێنەوە لە چـاو ژمـارەی مـرۆڤ هەر لە حەزرەتی ئادەمەوە - درووودی لەسـەر بێـت - تـا ئێسـتا، گەلـێ زیـاترە. زیندووکردنەوەی ئەم مێرووە و مێرووەکانی تر هەمـوو سـاڵێك تەنهـا لە چەنـد ڕۆژێکی بەهاردا، نەك تەنها یەك نموونە، بەڵکو هەزاران نموونەمان بەدەسـتەوە دەدەن بۆ زیندووبوونەوەی جەسـتەی مـرۆڤ بە کتـوپڕی و خێرایـی لە ڕۆژی قیامەتدا.

بەڵـێ، مـادەم دنیـا خـانەی دانسـت(حیکمەت) و ئەودنیـاش خـانەی توانست(قودرەت)ە، ئەوا بەدیهێنانی هەر شتێك لەم دنیـادا بە هەنـدێ کـات و لەسـەرخۆیی و هەنگـاو لە دوای هەنگـاو ئەنجـام دەدرێـت. ئەمەش بەپێـی خواسـتی "دانسـت"ی پەروەردگـار و بە گـوێرەی داخـوازیی زۆربەی نـاوە جوانەکانی چەشـنی: "الحَكـيم، المرُتِّـب، المُـدَبِّر، المُـرَبِيِّ". بەڵام لەودنیـادا "توانست" و "میهرەبـانی" زیـاتر دەردەکەون تـا "دانسـت". کەواتە پێویسـت بە مادده و ماوە و کات و چاوەڕوانی ناکات، چونکە لەوێ هەموو شتێك کتوپڕی دروسـت دەبن. ئەو خێراییەش کـە ئایەتی ﴿وما أَمرُ السَّـاعَـةِ إلَّا كَـلَمْحِ البصَرِ أَو هو أَقرب﴾ ئاماژەی بۆ دەکـات، ئەوە دەگەیەنێـت کە هەر شـتێك لێـرەدا بە

ماوەی ڕۆژێك یان ساڵێك دروست دەکرێت، لەودنیا لە ماوەی چرکەیەکی چەشنی چاو ترووکاندنێکدا بەدی دەهێنرێت.

گەر حەز دەکەیت تێبگەیت لەوەی کە هاتنی حەشر وەك هاتنی بەهاری داهاتوو کارێکی حەتمی و بێگومانە، ئەوا بە وردی سەیری: "وتەی دەهەم" و "وتەی بیست و نۆهەم" بکە. ئنجا گەر دوای خوێندنەوەی ئەو دوو وتەیە، بە ئەندازەی باوەڕبوونت بە هاتنی بەهاری ئایندە لە هاتنی حەشریش دڵنیا نەبوویت، دەتوانیت یەخەم بگریت و لێپرسینەوەی سەختم لەگەڵ بکەیت!

**مەسەلەی چوارەم:** مردنی دنیا و بەرپابوونی قیامەت.

نموونەی ئەمە وەك ئەوەی کە ئەگەر هەسارەیەکی گەڕۆك یان ئەستێرەیەکی کلکدار، بە فەرمانی خوای گەورە، بەر گۆی زەویمان بکەوێت، کە میوانخانەکەی ئێمەیە.. ئەوا ئەم خانە و لانەیەی - زەویمان - دەڕمێنێت، بە چەشنی ئەوەی کە لە ماوەی یەك خولەکدا کۆشکێك دەڕووخێنرێت کە بە دە ساڵ بنیات نرابێت.

* * *

ئێستا بە باسکردنی ئەم چوار مەسەلەیە واز دەهێنین کە تایبەتن بە حەشرەوە و، دەگەڕێینەوە سەر مەبەستەکەمان:

ئایا دەگونجێ قورئانی خاوەن ئیعجازی بەیان گوفتاری ئەو خواوەندە شکۆمەندە نەبێت، لە کاتێکدا کە ئەم قورئانە ڕوونکەرەوە و وەرگێڕێکی ڕەوانگۆی سەرجەمی ڕاستییە بەرزەکانی گەردوونە و، زمانی ئیعجازبەخشی هەموو کەماڵێکی بەدیهێنەری ئەم گەردوونەیە و گشت ئامانجەکانی ئەوی لەخۆدا کۆکردووەتەوە؟

نەخێر بە ئەندازەی ژمارەی نهێنیی ئایەتە پیرۆزەکانی نەخێر.

یان ئایا دەگونجێ ئەو کردگارە دانایەی کە هەموو بەدیهاتووە خاوەن هەستەکان و سەرجەم زیندەوەرانی وا لێ کردووە کە لەگەڵ یەکتری بدوێن و هەزاران جۆر گفتوگۆ دەرببڕن و گوێی لە دەنگی هەموویان بێت و لێیان تێبگات و بە ئاشکرا و لە ڕێی کار و نیعمەتەکانیەوە داوایان گیرا بکات و داواکارییەکانیان بهێنێتەدی، کەچی بۆخۆی نەدوێت و لە قسەکردندا دەستەوسان بێت؟ ئایا هیچ گریمانێك بۆ ئەمە هەیە؟ خۆ مادەم بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی خۆیشی دەدوێت و مرۆڤیش لە پێشەکیی ئەو بەدیهێنراوانەوەیە کە گوفتاری ئەویان ئاراستە کراوە و لێی تێدەگەن، ئەوا بێ هیچ گومانێك قورئانی پیرۆز لە پێشەکیدا و پاش ئەو سەرجەمی کتێبە پیرۆزەکانی تر گوفتاری ئەون.

یان ئایا دەگونجێ کردگاری دانا کە هەموو جۆر و پایەکانی ئەم گەردوونە مەزنەی بۆ زیندەوەران ملکەچ و گوێڕایەڵ کردووە بە ڕادەیەك کردوویەتی بە نیشتەجێ و پیشانگا و میوانخانەیەکی ئەوان و، هەردەم جۆرەکانی زیندەوەران کە لە هەزاران تێپەڕ دەبن زیاد دەکات، تەنانەت هەموو گەڵایەکی درەختی "چنار" و نەبق"ی وەك سەربازگەیەك لێ کردووە بۆ جۆرە مێروویەك لەوانەی کە بە هەوادا دەفڕن و زیکری خوا دەکەن و ئەو گەڵایانەی بە وێنەی ڕەحمی دایك کردووە بە لانك و ڕەحمی گەشەکردن و گەنجینەی ڕۆزی و ئازووقەکانیان.. کردگاری دانا ئەم گەردوونە بەم جۆرە ملکەچ و گوێڕایەڵ دەکات تاکو لەم ڕێیەوە خۆی بە خاوەن هەستان بناسێنێت و خۆشەویستی بکات لایان و، وا لە بەدیهاتووانیش بکات کە سەنا و سوپاس و ستایشی بکەن و، ئنجا ڕەزامەندی و خۆشحاڵیی لە زیندەوەراندا دروست کردووە بەرامبەر هەموو جۆرێکی چاکەکارییەکانی و، ڕەزامەندی و منەتباریی ئەوانی کردووە بە تەوەرەیەکی گرنگی پەروەردگارێتییەکەی..

ئایا دەگونجێ ئەم کردگارە دانایە ئاسمانە ڕازاوەکـان و ئەسـتێرە درەخشـانە پەرش و بڵاوەکان بێ خاوەن گیان و، بێ سەرنشین و، خـاڵی و بەتـاڵ و، بـێ کەڵك و سوود، واتە بێ مەلائیکەت و ڕۆحانییات واز لێ بهێنێـت و دەسـتیان لێ هەڵبگرێت؟

نەخێر بە ژمارەی مەلائیکەت و ڕۆحانییات نەخێر.

یان ئایا دەگونجێت کردگاری دانا و کارسـاز کە بە قەڵەمـی قەدەری خـۆی موقەددەراتی ژیـانی بچـووکترین ڕووەك و درەخـت بە کەمـاڵی ڕێکـوپێکی لە نـاوك و بەرەکەیـدا دەنووسـێت و، پێشـەکی و ئەنجامەکـانی بەهـاری مەزن بە وێـنەی نووسـینی یەك دانە درەخـت و بە کەمـاڵی جیـاوازی و ڕێکـوپێکی دەنووسێت، تەنانەت بایەخ بەو شتانەش دەدات کە مایەی بایەخ پێدان نین..

ئایا دەگونجێ ئەم کردگارە شکۆمەندەی کە ئەمانە دەکات، کردارە یەکجـار گرنگەکانی ئەم مرۆڤە نەنووسێت و وەستان و جموجووڵەکانی تۆمار نەکات و نەیانخاتە ناو بازنەی قەدەری خـۆی و بـایەخ بەم مـرۆڤە نەدات لە کاتێکـدا کە کـردوویەتی بە ئەنجـامی گەردوون و جێنشـینی ڕووی زەوی و بەڕێـوەبەر و سەرپەرشتیکاری گشت جۆرەکانی بەدیهاتووانی؟

نەخێر بە ئەنـدازەی ژمـارەی ئەو کـردەوانەی مـرۆڤ کە کێشـانە دەکـرێن، نەخێر.

**پوختەی قسە:**

هەموو گەردوون بەگشت حەقیقەتەکانیەوە هاوار دەکات و دەڵێت:

آمنتُ باللّهِ وملائكته وكُتُبِـه ورُسُـله وبالقَـدَر خيـره وشَرِّه مِـنَ اللّـه تعـالى، والبعثُ بعدَ المَوْتِ حَقٌّ. أشهَدُ أنْ لا إلهَ إلاّ اللّهُ وأشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رسولُ اللّـهِ صَلّى اللّهُ عليه وعلَى آلِه وصحبِه وإخوانِه وسَلَّم. آمين.

## موناجاتێكی تەوحيدی و پێشەكييەكەی

بە بـۆنەی دووپـاتبوونەوەی نـاوی "سراج النـور" لەم پەيـامەدا، وا لە كۆتاييەكەيدا موناجاتەكەی ئيمامی عەلی - رضيَ اللهُ عنه وكرّمَ وجْهَـه - بە دوو پلە فراوان دەكەين و زمانمـان لەپێنـاوی زمـانی بەرز و بڵنـدی ئەودا دەخەينە قسـە و، ئەم موناجـاتەی خوارەوە پێشـكەش بە ديوانی خواوەندی تاك و تەنيـا - جلّ وعلا - دەكەين:

### موناجاتێك

اللّهم إنه ليسَ في السّموات دوراتٌ ونجومٌ ومُحَّركـاتٌ سيّاراتٌ، ولا فـى الجوّ سحاباتٌ وبروقٌ مسبِّحاتٌ ورَعداتٌ، ولا فى الأرضِ غَمَراتٌ وحيوانـاتٌ وعجائبُ مصنوعات، ولا فى البحارِ قَطَراتٌ وسَمَكاتٌ وغَرَائـبُ مخلوقـات، ولا في الجبـالِ حجَـراتٌ ونباتـاتٌ ومـدخرات معـدنيات، ولا فـى الأشـجار ورقاتٌ وزهرات مزيناتٌ وثمراتٌ، ولا فى الأجسام حَركاتٌ وآلاتٌ ومـنظماتُ جهازات، ولا فى القلوب خَطَراتٌ وإلهاماتٌ ومنوّراتُ اعتقـادات.. إلاّ وهـى كلُّها علَى وجوب وجـودكَ شـاهداتٌ وعـلى وَحـدانيتك دآلآتٌ وفـى مُلكـكَ مُسَـخَّراتٌ. فبالقدرةِ التي سـخّرتَ بها الأرَضين والسـموات سـخّرْ لي نفسي وسخِّرْ مَطلوبي وسخِّرْ لرسائل النور ولخدمةِ القـرآن والإيـمان قُلـوبَ عبـادكَ وقلوبَ المخلوقاتِ الرّوحانيات من العُلويات والسُفليات، يا سميعُ يـا قريـبُ يا مجيبَ الدعوات..

والحمدُ للّه ربِّ العالمين.

﴿سُبْحانكَ لا عِلْمَ لنا إلاّ ما علَّمْتَنا إنّكَ أنتَ العليمُ الحَكيم﴾.

# پوختەیەک لە ژیانی دانەر

* ناوی "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی"یە . لە نێوان (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.
* لە گوندی "نوورس"ی سەر بە پارێزگای "بەدلیس"ی کوردستانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانی (باکووری کوردستان) لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایك بووە.
* باوکی هەر خۆراکێك حەڵاڵ نەبووبێت دەرخواردی مناڵەکانی نەداوە.. دایکیشی بە پاك و خاوێنی و دەستنوێژەوە نەبووبێت شیری بە مناڵەکانی نەداوە!
* لە پێشدا لە لای برا گەورەی دەستی بە خوێندن کردووە. پاشان لە چەندین گوند و شاری کوردستان لای زانا گەورەکان وانە گرنگەکانی خوێندووە.
* لە تەمەنی چوارده ساڵیدا بڕوانامەی باڵای لە زانستە ئیسلامییەکاندا بەدەستهێناوە.
* بە هەوڵ و تەقالای خۆی شارەزایی لە زانستەکانی ڕۆژگاردا، وەك: کیمیا، فیزیا، بیۆلۆجی، جیۆلۆجی، بیرکاری، گەردووناسی، جوگرافیا، هتد.. پەیدا کردووە.
* لە لایەن زانایانەوە نازناوی (سەعیدی مەشهوور) و (بەدیعوززەمان)ی پێ دراوە.
* یەکەم کەسە هەوڵی داوە بۆ دامەزراندنی زانکۆ لە کوردستاندا و، کردنەوەی قوتابخانەی کوردی. لەو پێناوەشدا ڕووبەڕووی چەندین گرفتی دژوار بووەتەوە.
* گەورەترین زانا و کەسایەتیی کوردە کە لە دوای مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە ڕووبەرێکی فراوانی سەر زەویدا سوود لە بەرهەمەکانی وەردەگیرێت.
* لە سایەی ڕژێمی مستەفا کەمالدا ڕووبەڕووی سی و پێنج ساڵی بەندی و دوورخستنەوە و دەیان دادگای تۆقێنەر بووەتەوە.
* زیاتر لە سەد و سی کتێب و نامیلکەی لە ژێر ناونیشانی (**سەرجەمی پەیامەکانی نوور**)دا نووسیوە و بڵاوی کردوونەتەوە.
* **سەرجەمی پەیامەکانی نوور** لە لایەن مامۆستا (ئیحسان قاسم صالحی)یەوە کراوە بە عەرەبی و لە دە دانە بەرگی گەورەدا بڵاوکراوەتەوە.
* بەشێکی زۆریشیان لە لایەن خوشکی نۆموسڵمان ماری وێڵد (شوکران واحیدە)وە کراون بە (زمانی ئینگلیزی) و بڵاو کراونەتەوە.
* بە (زمانی کوردی)ش (**سەرجەمی پەیامەکانی نوور**)مان لە نۆ بەرگی گەورەدا چاپ کردووە، جگە لە سی و حەوت کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ.

* چەندین کتێبی تر بە زاری کرمانجیی ژووروو بڵاوکراونەتەوە.
* چەند بەشێکی ئەم پەیامانە بۆ زیاد لە پەنجا زمانانی جیهانی وەرگێڕراون، کە تا ئێستا کاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە.
* زیاتر لە شەست کۆنفرانسی جیهانی و دەیان کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا لەسەر کراوە و، دەیان کتێب و، سەدان لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە و، چەندین بەڵگەنامەی زانکۆییشی لە خوێندنی باڵادا لەسەر وەرگیراوە، کە هەندێکیان لە کوردستاندا بووە.
* لە وڵاتی هیندستان پەیمانگایەکی تایبەت بە ناساندنی مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی دامەزراوە، کە خوێندن تیایدا بەردەوامە.
* دواهەمین گەورە کۆنفرانسی زانستیی جیهانی لەسەر مامۆستا بەدیعوززەمان لە شاری ئەستەمبوڵ لە بەرواری (١-٢٠١٧/١٠/٣ز)دا بەڕێوەچوو، کە زیاتر لە سەد توێژینەوەی زانستیی تێدا تاوتوێ کرا و، چەند توێژەرێکی باشووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.
* لە باشووری کوردستاندا، هەتا ئێستا سێ سیمینار ساز کراوە بۆ مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی، لە شارەکانی (هەولێر، سلێمانی، سۆران).
* کۆڕبەندێك لە بەرواری (٢٠١٣/١٢/٢١ز) لە شاری هەولێر لە لایەن وەزارەتی ئەوقافی کوردستانەوە ڕێکخرا بە بەشداریی چەند توێژەرێکی ناوخۆی کوردستان و وڵاتی تورکیا و، چەندین کەسایەتیی زانستیی عێراق و هەرێم.
* لە بەرواری (٢٠١٥/١٢/١٢ز)دا (ڕێکخراوی پەیامی پاك) لە هەولێر نەدوەیەکی زانستیی ساز کرد بە ناوی "نووری نبووەت لە پەیامەکانی نووردا" کە چەند توێژەرێکی باکووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.
* لە بەرواری (٢٠١٦/٣/٢٦ز)شدا لە شاری هەولێر (ئەمینداریتیی گشتیی ئەنجومەنی زانایانی عێراق) و سەنتەری (وقف الخيرات) نەدوەیەکیان ساز کرد بە ناوی (الإمام بديع الزمان سعيد النورسي ومنهجه في إحياء الإيمان).
* دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە سلێمانی ژمارە (٨٩)ی بڵاوکراوەی (ڕۆڤار)ی بە ناوی (سەعید نوورسی.. کلیلی گەنجینەیەکی شاراوە) بڵاو کردەوە.
* هەتا ئێستا لە باشووری کوردستاندا شەش مزگەوت بە ناویەوە ناونراوە لە شارەکانی (سلێمانی، سۆران، کەرکووك، هەولێر، پێنجوێن، هەڵەبجە).

# پێڕستی بابەتەکان

* * *

## (پەیامەکانی نوور) بە زمانی کوردی

### یەکەم: کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ

١ - پەیامی بیماران
٢ - پەیامی پیران
٣ - وتە بچووکەکان
٤ - سروشت هونەرە یان.. ؟!
٥ - مەلائیکەت و ژیانی دوارۆژ
٦ - پەیامی ڕەمەزان
٧ - حیکمەتی خۆپەنادان لە شەیتان
٨ - پەیامی ئیخلاس و برایەتی
٩ - زللەی میهرەبانی
١٠ - چارەسەری وەسوەسە
١١- مرۆڤ و ئیمان
١٢ - بەری درەختی ئیمان
١٣ - موعجیزاتی ئەحـمەدی
١٤ - ئیجتیهاد لەم سەردەمەدا
١٥ - پەنجەرەکان
١٦ - پەیامی حەشر
١٧ - (من) خودیی مرۆڤ
١٨ - ڕابەری لاوان
١٩ - ڕابەری خوشکان
٢٠ - ڕابەری خزمەتگوزارانی قورئان
٢١ - ڕاستییەکانی ئیمان
٢٢ - ڕاستیی تەوحید
٢٣ - شوکرانەبژێری
٢٤ - بینینەکانی گەشتیارێك
٢٥ - میعراجی پێغەمبەر ﷺ
٢٦ - موعجیزاتی قورئانی
٢٧ - سوننەتی پێغەمبەر ﷺ
٢٨ - نوورەکانی حەقیقەت
٢٩ - موناجات
٣٠ - کلیلێك بۆ جیهانی نوور
٣١ - وتاری شام
٣٢ - مونازەرات
٣٣ - بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی
٣٤ - سنووحات
٣٥ - گزنگەکان.. ئاماژەکان ..
٣٦- پەیامی قەدەر
٣٧- تەوحید.. بەروبوومەکانی..
٣٨ - ناوی هەرە مەزنی خوای گەورە

### دووهەم: کۆمەڵە پەیام و بەرگی گەورە

١ - وتەکان
٢ - مەکتووبات
٣ - بریسکەکان
٤ - تیشکەکان
٥ - پاشبەندەکان
٦ - داوەرییەکان
٧ - ئاماژەکانی ئیعجاز
٨ - مەسنەویی نووری
٩ - ژیاننامەی بەدیعوززەمان
سەعیدی نوورسی

# تەوحید

**ئەگەر دەتەوێ بزانیت کە:**

- چۆن بە ڕوانینی **"تەوحیدییانە"** سەیری کارە سەرتاپا ڕێك و جوانەکانی خوای گەورە بکەیت؟
- لە ئاوێنەی بوونەوەراندا چۆن جێدەستی کردارکانی خواوەند و درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی ببینیت؟
- چۆن بەهۆی **"تەوحید"**ەوە ئەرکی سەرشانی بوونەوەران دەردەکەوێت و، حیکمەتی بەدیهێنان و ئاڵوگۆڕە گەردوونییەکان ئاشکرا دەبێت؟
- ئەم مرۆڤەی کە بەنرخترینی بەروبوومەکانی گەردوونە، خواست و ئامانجەکانی تەنها بەو کەسە دێنەدی کە فەرمانی لە سەرانسەری گەردووندا جێبەجێیە!

ئەگەر حەز دەکەیت ئەم بابەتانە و بابەتەکانی هاوشێوەیان بزانیت، ئەوا فەرموو بە وردی ئەم کتێبە بخوێنەرەوە.

## التوحيد

### مِن ثمَرَاتِه و أدلَّتِه و علاماتِه

من كليات رسائل النور

التي ألفها الأستاذ:

**بديع الزمان سعيد النورسي**

(رحمه الله)

## MONOTHEISM

### Some of its Fruits, Proofs, and Signs

From

The Risale-i Nur Collection

By:

**Bediuzzaman Said Nursi**

0-0258-0000-0

9 780025 800007

نرخی (١٠٠٠) دیناره